

# بوونی خوا

نووسینی
دکتور یوسف القرضاوي

وەرگێڕانی
حەسەن پێنجوێنی

چاپی یەکەم

١٤١٨ك ١٩٩٧ز

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على محمد وآله وصحبه أجمعين ومن تبعه بإحسان إلى يوم الدين ..

خوێنەری ئازیز، بیروباوەڕ بناغەو بنچینەی هەموو کارو کردەوەیەکە، ئەو باوەڕە چەند بەهێزبێ، ئەوەندە کاریگەر دەبێ.. چەند پتەو بێ، ئەوەندە لە کارو کردەوەو ژیانی رۆژانەدا رەنگ دەداتەوەو خۆی دەنوێنێ ..

بیروباوەڕ (عقیدە) دەبێ دامەزراوبێ، گومان و دوودڵی تیانەبێ، ئەوکاتە بەرهەمی جوان و شیرینی دەبێ، ئەو کەسەی کەدەڵێ: باوەڕم بە بوونی خوا هەیە، چۆن یەقینی هەیە، کە: یەک و یەک دەکاتە دوو، دەبێ ئاوایش یەقینی لە بوونی خوادا هەبێ.. خۆ ئەگەر (عەقیدە) گومان و دوودڵی تیابێ، بەئەندازەی ئەو ناتەواییە، بەرهەمی ناتەواوی دەبێ، کاروکردەوەکەی چەوت و چەوێل و ناشیرین دەبێ..

لەبەرئەوە دەبێ (عەقیدە) یەقینی بێ، بۆیە لاسایی‌کردنەوەو چاولێکەری وەرناگیرێو دەدرێتەدواوە، چونکە عەقیدەیەکی یەقینی وا دروست ناکات کەلەسەر بەڵگەو دەلیلەوە بێ، کەسێکیش بۆ عەقیدەکەی بەڵگەو دەلیلی نەزانێ لەوانەیە سەرلێشێواوێک بەچەند قسەیەک سەرگەردانی بکات ..

باوەڕ بە بوونی خوایش گرنگترین بەشی‌عەقیدەیە، دەبێ مرۆڤی موسڵمان لەبارەی باوەڕەکەیەوە بەڵگەو دەلیلی هەبێ، بۆ ئەم مەبەستەیش کتێبی زۆر بەعەرەبی نووسراوە، بەزمانی کوردیش چەند نامیلکەیەک نووسراوە، ئاست و تام و بۆنیان جیاوازە، هی وایان هەیە بەهێزە، هی وایشیان هەیە لاوازە.. هی وایان هەیە بەپێزو بەچێژە، هی وایان هەیە کرچ و بێ‌تامە، هی وایشیان هەیە ناوەنجی‌یە..

کتێبێک کە ئاستێکی باشی‌هەبێ، وە زۆر گران نەبێ، وە زۆر دووروودرێژ نەبێ، وە بەڵگە زانیاری(علمی)یەکانیشی لەگەڵ بەڵگەی قورئانی‌دا دەست لەملان کردبێ، کتێبی (وجود الله)ی نووسینی مامۆستا (یوسف القرضاوی)بوو، کە بۆ خوێندنی بەرنامەی قوتابخانە ئاینییەکان نووسیبووی..

*بۆ ئـەوەی خوێنـەری کوردیش لـەو بەرهەمـە قەشـەنگەی مامۆسـتا (قرضاوی) ئاگاداربێ، وەرم گێڕایە سەر زمانی کوردی.. لـەو شـوێنانەش دا کە بەپێویستم زانیبێ بۆزیادە روون کردنەوە پەراوێزم بۆ کردووە..*

*پێویستە ئـەوەش بڵێـم، کـە : وەرگێڕانەکـە (ترجمة)ی (حرفـی) نییـە، بەڵکو وەرگێڕانە بەپێی مەبەست، لەوانەیە لەهەندێ شوێنیش دا وەرگێڕانی پیت بەپیتی تیا بێ ، ئەگەر هەستم بەوەکردبێ کەگرێ و رەگێکی تیـا نییـە وازم لێهێنـاوە.. لەوانەشـە لەهـەندێ شـوێن دا پێـم نـەزانیبێ.. بەهــەرحاڵ ئیددیعای ئەوە ناکەم کە بێعەیبەو کەم وکوڕی بێ.نەء ـ بەڵکو داوام وایە لە خوێنەرانی بەڕێز: رای خۆیان لەبارەیەوە دەربـڕن و لـە کـەم وکوڕیـیـەکانی ئاگادارم بکەنەوە، هیوادارم سوودی هەبێو خوایش بە لوتفـی خـۆی بیکاتـە زەخیرەی رۆژی قیامـەتمان إنه نعم المولى ونعم النصير .*

**وەرگێڕ : حەسەن ی پێنجوێنی**

**لە خیابانی حەسەن ئاوای، سنە**

**١٤٠٩ هـ ، ١٩٨٩ ز**

# ڕێخۆشکردن

سوپاس و ستایش بۆ خوای تاک و تەنیا، سڵاو لەسەر بەندەکانی هەڵبژاردەی، بەتایبەت دواین هەڵبژاردەیان، کە -محمد المصطفى- یە ﷺ.

پاشان .. ئەمەی کە لەبەردەستایە، باسێکی سەرەتاییە لەبارەی گەورەترین و لەپێش ترین مەسەلەیەک لەناو بیروباوەڕو ئایین وفەلسەفەکان دا. کە ئەویش بوونی خوایە، دامەزرێنەری بوونەوەر، ژیان دەرو بەخشندەی ژیان و دروستکەرو بەدیهێنەری ئینسان ..

ئەم باسە لەلایەن زانایانی پێشینەوە بایەخێکی ئەوتۆی پێنەدراوە، ئەو زانایانەی کە خەریکی زانیاری (کەلام)[1] بوون -ئەوەندەی باسی سیفاتی خوا مەشغوولی کردبوون باسی بوونی خوا سەرگەرمی نەکردبوون.

بەڵێ، ئەوان سەرگەرمی سیفاتەکانی خوا بوون: ئایا ئەو سیفاتانە خوودی خوان، یا جگە لە خوان ؟! یا ئەو نییەو[2] ئەمیش ؟؟!

ئەو سیفەتە جێگیرانەی پێیان دەگوترێ: (الصفات الخبرية)[3] و لەڕواڵەت دا لەسیفەتی (مخلوقات)و دروستکراوانی خوادەچن، ئایا لەناودەچن ؟ یا بەبێ لێچوان (تشبیه)و بێهاتن بە خەیاڵ دا (تخیل) وەک خۆیان دەمیننەوە؟!

بەم جۆرە جەنگ و جەدەل -لە نێوان: (ئەهلی سوننەت) و (موعتەزیلە)[4]دا لەلایەکەوە، لەلایەکیترەوە لە نێوان خوودی ئەهلی سوننەت دا بەپێشینان[5] و ئەشعەرییەکانیانەوە[6] - بەردەوام بوو ..

---

[1] زانیاری کەلام (علم الكلام) بەو زانیاریە دەگوترێ: کە ڕێسا (قاعدە)کانی دین، بەفەلسەفەی عەقڵی دەسەلمێنێو لەسەر بنچینە ژێربێژیو (منطق) دانراوە. ئەم زانیاریە لەسەدەی دووهەمی هیجریو لەسەردەمی عەباسییەکاندا دروست بوو.. بۆیە ناونرا زانیاری کەلام چونکە یەکەم مەسەلەیەک جیاوازی لەنێوان زانایاندا دروستکرد مەسەلەی قورئان بوو، ئایا قورئان کەلامی خوا، کۆنە یا نوێیە؟ قەدیمە یا حدیثە، (دائرة معارف القرن العشرين، ٨\١٧٣٠).

[2] ئەم سیفەتانە خودان یا غەیری خوان؟ یا نەخودایەو نە غەیری خوا؟ لاهو ولا غيره..

[3] سیفاتی خەبەری، پێیشیان دەگوترێ: ( صفات الثبوتية) وە بریتین لەم حەوتە: العلم والقدرة والإرادة والسمع والبصرلا والكلام والحياة.

[4] موعتەزیلە، لەدوای ناکۆکی نێوان حەزرەتی عەلیو مەعاویەوە پەیدابووە، خەواریجەکان پێیان وابوو: ئەوەی گوناهی گەورە بکات، کافر دەبێت، کۆمەڵ (جماعە)یش دەیان گوت: کافر نابێو ئیمانیان لێداناماڵرێ، بەڵکو فاسق دەبن.. واصلی کوڕی عەطا کە بناغەدانەری موعتەزیلەکان بوو وە شاگردی حەسەنی بەصریبوو بۆچوونی هەردوولای پێ هەڵەو ئیشتیباه بوو، واصل بۆچوونی وابوو: کە (فاسقی ئومەتی ئیسلامی نە کافرەو نە ئیماندار، بەڵکو جێگەیەکی تایبەتی هەیە لەنێوان هەردوو کۆمەڵەکەدا) لەسەر ئەم بۆچوونە حەسەنی بەصری لە مەجلیسەکەی خۆیا دەریکرد، ئەویش لەگۆشەیەکی مزگەوتەکەوە خەریکی دەرس بوو، قەتادە کە پیاوێکی کوێربوو ویستی بچێ بۆلای حەسەنی بەصری ڕۆیشتە ئەڵقەی (واصل)ەوە، وای زانی حەسەنی بەصرییە، کاتێ بۆی دەرکەوت هەستاو گوتی: ئەمە گۆشەگیرەکانن پێیان وایە سیفات نین (دائرة المعارف ٧\٦٣٢وة ١٠\٦١٨).

بەڵام بوونی خوا لای هەموو دەستەو کۆمەڵەکان شتێکی سەلمێنراوو بەڵگەنەویست بووە بەپێی سروشتی ئادەمیزاد.. خۆ ئەگەر بڵێی کتێبەکانی (کەلام)و (فەلسەفە) لەبارەی بوونی خواوە بێبەڵگەو دەلیل نەبوون، لەم رووەوە کە خوا بەدیهێنەری بوونەوەرەو بوونی پێویستە، واتە (واجب الوجود)ە.

زانایانی (کەلام) لەناو بەڵگەو دەلیلەکانیانا، هێما (اشارة)یان کردووە بۆ بوونی خوا، وەک لە بەڵگەی پەیدابوون (دليل الحدوث)دا دەبینرێ، هەرچەند ئەم بەڵگەیەش لە ناوەرۆک و بۆچوون دا کرچ و کاڵ و لەباس کردنا وشک و بێپێزە.. بۆ نموونە دەڵێ: دنیا لە گۆڕاندایە، هەر شتێکیش گۆڕانی بەسەرابێت پەیدابووە، وە هەموو پەیدابوویەک پێویستی بە پەیداکەرێک هەیە، کە ئەویش خوای گەورەیە..

لەناو ئەم بەڵگەیەدا چەند کەلەبەرێک هەیە، کە زانایانی (کەلام) خۆیان باسیان کردووە. فەلاسیفەکان و غەیری ئەوانیش روونیان کردۆتەوە..

---

[5] پێشینان واتە: (سلف) ئەوانەی کەلەریزی (سلف)دا حسیب دەکرێن وەک : مالك بن انس و احمد بن حنبل و داود الأصفهاني و تا دەگاتە سعيد الكلابي و مقابل بن سليمان وابي العباس القلانسي و ابن المحاسبي.. سەلەف پێیان وایە سیفاتی خوا هەیەو جێگیرەو نە خودی (ذات)خوایەو نە جیاوازیشە لە خوا.. لەبەرئەوە پێیان دەگوترێ (صفاتية).. موعتەزیلەش لەبەرئەوە کە پێیان وایە خوا سیفەتی نییە پێیان دەگوترێ (معطلة).. ( دائرةالمعارف ٥\٤٩٩).

[6] بەوانە دەگوترێ کە شوێن بۆچوونی (ابوالحسن ی ئەشعەری) کەوتوون. ئەشعەری زانایەکی ناودارو بەناوبانگی ئەهلی سوننەتە، کۆمەکێکی گەورەبوو بۆ ئەهلی سوننەت و تێشکاندنی موعتەزیلەکان، پێشان موعتەزیلە بووەو ئینجا پەشیمان بوەتەوە وازی لێهێناون. لەمزگەوتی جامع ی بەصرەدا بەدەنگی بەرز بانگ دەکات: خەڵکینە، ئەوەی دەمناسێت، ئەوا دەمناسێ، ئەوەش نامناسێت خۆمی پێ دەناسێنم، من (ابوالحسن علي بن اسماعيل الأشعري)م، من جاران دەمگوت: قورئان (مخلوق)و دروستکراوە، دەمگوت: خوا نابینرێ، دەمگوت: ئێمە (خالق)ی کاری خراپی خۆمانین و خوا دروستی نەکردووە، بەڵام ئێوە بەشاهید بن من پەشیمان بوومەوە لەو قسانەی کە کردوومن، تەوبەم کرد لێیان، وە من ئامادەم بۆ پەرچ دانەوەیان و دەرخستنی هەموو کەم و کوڕییەکان.. (دائرةالمعارف ٥\٤٠٠).
هۆی جیابوونەوەکەیشی ئەمە بووە، رۆژێک لە مامۆستاکەی دەپرسێ: قوربان، تۆ رات چۆنە بەرامبەر ئەو سێبرایەی کە: یەکێکیان ئیماندارو پیاوچاک، دووەمیان کافرو تاوانکار، سێهەمیان منداڵ.. هەرسیانیان بەو جۆرە دەمرن، ئایا حاڵیان چۆن دەبێ؟ ئەبو عەلی جەبائی کە مامۆستاکەی بوو، گوتی: پیاوچاکەکەیان بەهەشتییە، کافرکەشیان جەهەننەمییە، منداڵەکەش سەلامەتەو بێوەی.. ئەشعەری گوتی: ئەگەر منداڵەکە بیەوێ بچێت بۆ جێگەی زاهدو چاکەکە، رێگەی پێدەدرێ؟ جەبائی گوتی: نەخێر، چونکە پێی دەگوترێ: ئەم برایەی تۆ بەهۆی طاعەت و عیبادەتیەوە گەیشتۆتە ئەو پلەیە، تۆیش ئەو طاعەت و عیبادەتەت نەبووە.. ئەشعەری گوتی: ئەگەر منداڵەکە بڵێ، نکوڵی لە منەوە نەبووە، تۆ منت مراندووەو نەت هێشتووە من بگەم بەکاتێ توانای طاعەت و عیبادەتم هەبێ.. جەبائی گوتی: خوا دەفەرموێ: من دەمزانی ئەگەر تۆ بمێنیتەوە گوناه دەکەیت و موستەهەقی سزای جەهەننەم دەبیت، لەبەرئەوە بەرژەوەندی تۆم پاراستووەو رعایەتی مەسڵەحەتی تۆم کردووە، ئەشعەری گوتی: ئەگەر برا کافرەکەیان گوتی: ئەی خوایە، پەروەردگاری جیهان، هەروەک حاڵی ئەوت زانیوە حاڵیمنیشت زانیوە، بۆچ چاودێری بەرژەوەندی ئەوت کردو منت بێبەش کرد؟! ئایا خوا چ وەڵامێکی دەداتەوە؟! جەبائی داری لەدەست دەکەوێتە خوارو وەڵامی بۆ نادرێتەوە، ئەوە ئەبێ پێی بڵێ: تۆ شێت بوویت.. (دائرة معارف القرن العشرين ٣\٢٢).

بەڵام ئەوانەی خۆیان بە فەلسەفەوە هەڵواسیبوو، یەعنی (متفلسف)بوون، خوویان بە (دلیل الإمکان)ەوە گرتبوو، پشتیان بەو بەڵگەیە بەستبوو کە لەناو باسەکەدا هێنامان بۆ کرد..

ئەوانەی کە بایەخیان بە (دلیل الکون) دابوو، زۆر کەم بوون، مەبەست لە (دلیل الکون) ئەو بەڵگەو دەلیلانەیە کە بەهۆی نایەتەکانی خوداوە لە خۆمان و دەوروبەرماندا خوامان پێش چاو دەخات و پێمان دەسەلمێنێ.. ئەو زانایانەی لەم بارەوە بەڵگەیان هێناوەتەوە وەک: (الجاحظ)و (ابن القیم) و چەندەها کەسی تریش جگە لەمان .

بۆ دوو سەدە دەچێت ئایین لە ئەوروپادا بەهۆی هەڵوێستی کەنیسەوە بەرامبەر زانیاری و زانایان و بیرکردنەوەی خاوەن بیران ئایین لەو ناوچەیەدا تووشی بەڵایەکی گەورەبوو کە بووە هۆی ئەوە بەشێکی زۆر لەخەڵکی واز لە دین بێنن و باوەڕیان بەخوا نەمێنێ.. هەرچەند لەراستیدا ئەوان بێبڕوابوون بە کەنیسەو باوەڕیان بە خوای کەنیسە نەمابوو، نەک بە ئایینی راستی و خوای راستەقینە، چونکە ئەگەر بۆیان رێک کەوتبێ ئایینی راست و خوای راستەقینە بناسن دەگەڕێنەوە بۆ ناو کۆزو پەرێزی ئیمانداران..

هۆی لەدین لادانی ئەوانە، هەرچی بێ، خۆ لایان داو بێدین بوون، وە پزیسکی ئاگری بێباوەڕی لە ئەوروپاوە گەیشتە ولاتانیتر، وەچەندەها دەولەت لەسەر بنچینەی بێباوەڕی دامەزرا، دەقی یاساکانیان دەڵێ: (خوا نییەو ژیان ماددەیە)!!.

دنیای ئەمرۆ -وەک هەندێ لە فەیلەسوفەکان دەڵێن:- وەک دێو ئاواییەکی گەورە وایە، پەتاو درمی بێباوەڕی تیا بلاوبووەتەوە، بەجۆرێکی زۆر گەورەو خێراتر لە درم و پەتای هەر نەخۆشیەکی تر.. هەندێ لە دەولەتان رێگەی خۆپاراستنیان گرتۆتەبەرو قورەتینەیان دروست کردووە تا بەرگیری لە بلاوبوونەوەی پەتا کوشندەکان بکەن.. بەڵام بەشێکی زۆریان هەمان ئاگربڕیان لەدژی بلاوبوونەوەی بیروبۆچوونە چەوت و زیان بەخشەکان نەکردووە.. لەگەڵ ئەوەدا کە ئەمجۆرە دەردە -بیروباوەڕی تێکدەر- زۆر کوشندەترو مەترسیدارترە..

هیچ جێگەی سەرسوڕمان نییە کە جیهانی ئیسلامیشمان گرفتاری کۆمەڵێ بێباوەڕ (ملحد)ی پەروەردەکراوی مەمکەی ژەهراوی ئەمریکاو ئەوروپا ببێت.. ئەوانەی لە رۆژئاوا خوێندبوویان. وە ئەوانەش کە لەخاکی خۆماندا و لەبەردەست ئەواندا فێری خوێندن ببوون لاسایی مامۆستاکانیان دەکردەوە، چونکە لەسەر بەرنامەیەک دەڕۆیشتن کە دوژمنی کافر بۆی دانابوون و ئاراستەی دەکردن، پێگەیشتنیشیان لەو قوتابخانانەدا بوو کە ئەو بۆی دروست کردبوون..

دەبینین کۆمەڵێ لاوی چاک و پاک بێئەوەی دەستەچەپی یا دەستەراستیی بن ئەم بیروباوەڕە چەوتانە بێئارامیو خەم و تەمێکی لەدڵ و دەروونیاندا دروست

کرد.. لەوکاتەدا لە ئێزکەبووم نامەی زۆرم بۆ دەهات، وە هەروەها لەو شوێنانەش دا کە وتارم دەداو قسەم دەکرد، پاش وتارەکە ئەم پرسیارەم لێدەکرا: بەڵگە لەسەر بوونی خوا چییە؟ لەگەڵ ئەوەدا هیچ جۆرە گومانێکیان لە بوونی خوادا نەبوو، بەڵام دەیان ویست قەناعەت بە گومانداراەکان بکەن و گومان دروست کەرەکان دەم کوت بکەن..

هەر لەبەر ئەمەبوو، کاتێ گوێم لێبوو: هەندێ لە زانایانی (قەتەرو شانشینی عەرەبی سعودی)، لەبارەی رای پێشینان و پاش کەوتوان (متقدمین و متأخرین)ەوە، دەمەقاڵەیان بوو، باس و خواسێکی دووروودرێژیان بوو لەبارەی سیفەتەکانی خوداوە.. -وەک پێشنیازێک پێم گوتن: جەنگی ئەمڕۆمان لەگەڵ ئەشعەریەکان[7] و ماتوریدیەکان[8] و موعتەزیلە[9] و جوهەمیەکان[10] دا نییە.. بەڵکو جەنگی گەورەمان لەگەڵ ئەو بێباوەڕانەدایە، کە باوەڕیان بە خواو بە پێغەمبەرو قورئان نییە..

بەڵێ، هیچ هەرایەکمان لەگەڵ ئەوانەدا نییە کە دەڵێن: خوا جێگەیەکی دیاریکراوی نییە، بەڵکو هەرا (معركة)مان لەگەڵ ئەوانەدایە کە دەڵێن: هەر خودی خوا نییە!! هەروەک بێباوەڕێکیان گوتی: پێویستە لەسەرمان ئێوە خوا دروست بکەین و خەلقی بکەین!!

هەرامان لەگەڵ ئەوانەدا نییە کە تەفسیرو تەئویلی سیفەتەکانی خوا دەکەن، بەڵکو لەگەڵ ئەوانەدایە کە بەتەواوی ئینکاری بوونی خوا دەکەن..

---

[7] لە لاپەڕەکانی پێشوودا باسی ئەشعەریەکانمان کرد، ئەمان رایان رای ئەهلی سوننەتەو سیفەتە خەبەریەکان دادەنێن بۆ خواو دەڵێن: خوا زیندووەو زانایەو توانایەو خاوەنی ویستەو بیسەرەو بینایەو خاوەن قسەیە.

[8] ماتوریدیەکان شوێن کەوتەی ئیمام (ئەبو مەنصوری ماتوریدی)ن، ئەمانیش رایان رای ئەهلی سوننەتە، سەرۆکی ئەم دەستەیە ناوی (محمد ابو منصور السمرقندي)ە. لەساڵی ٣٣٣هـ کۆچی دوایی کردووە، حەنەفی مەزهەب بووە، لەمەسەلەی فیقهدا، شارەزای فیقهو ئوصول بووە، یەکێک بووە لەپێشەوایانی زانیاری (کلام)، لە سەمەرقەند لەدایک بووەو هەر لەوێش مردووە. بەرگرییەکی زۆری کردووە لە بۆچوونی ئەهلی سوننەت لەدژی موعتەزیلەو گرۆکانی تر.. نووسەرێکی گەورە بووە، هەندێ لەکتێبەکانی ئەمانەن: ١-شرح الفقه الأكبر، ٢-التوحيد، ٣-مأخذ الشرائع. (المنجد في الأعلام ط١٢ص٦٢٥).

[9] موعتەزیلە: کۆمەڵێکن لەعەقیدەدا پەیڕەوێکی دیاریکراویان هەیە کە لەچوار خاڵدا کورت دەکرێتەوە: ١-نەفی سیفاتی خوا دەکەن، ٢-عەبد خۆی خاوەن ویستە بۆ هەموو کردەوەیەکی چاک یا خراپ وە خۆی خالقی فیعلی خۆیەتی، ٣-ئەوەی گوناهی کەبیرە بکات نە موسڵمانەو نەکافر، وە نە بەهەشتییەو نە جەهەننەمییە، ئەگەر بەبێ تەوبەیش مرد بۆ هەمیشەیی لەجەهەننەمدا دەمێنێتەوە. ٤- لەشەڕی (صفین)دا یەکێ لەو دوو کۆمەڵە لەسەر حەق نەبووە، بێدیاریکردن.. (دائرة معارف القرن العشرين ١٠\٦١٩).

[10] بەو کۆمەڵەی شوێن کەوتەی (جهم بن صفوان)دەگوترێ، کە لەگەڵ موعتەزیلەدا یەکێکن لەنەفی صیفاتدا، وە پێشی وایە ئینسان (مجبر)ە نەک (مخير) وە ئینسان لە کردەوەکانیدا نە توانای هەیە نە ویستی هەیە نە هەڵبژاردن، بەڵکو هەموو کارێکی بەزۆر پێدەکرێ.. (دائرة المعارف ٣\٢٦٦).

پێم وایە: بەهەرجۆرێک هەراکە لەسەر ئەم هێڵەی خۆی لابدرێ، واتە: دوژمنی سەرەکی خۆمان نەناسین- دادەنرێت بە لاوازکردنی ریزی بەرگریو راکەدن لەبەرامبەر دوژمنەوەو بگرە یارمەتیدانیشی..

زۆر ناسوودە ویژدانم کە دەڵێم: زۆر بە جوانی وەلامی پێشنیازەکەم درایەوەو وەرگیرا لەلایەن زانایانی ( قەتەر[11] و شانشینی عەرەبی سعودی)ەوە، جگە لە ژمارەیەکی کەمیان..

ئالێرەدا گەیشتمە ئەو ئەنجامە، کە: بەشێکی جەنگ و هەرامان لەگەڵ بێباوەڕیدا بریتییە لە بەڵگەهێنانەوە بۆ سەلماندنی بوونی خوا تا لاوە ئیماندارەکان چەکی بەڵگەیان بدرێتە دەست و ئەوانەش کە لە شپرزەییو دڵەڕاوکێدا دەژین، شپرزەییو گومانیان نەمێنێو ئەوانەش مل بادەدەن دەمکوت بکرێن..

بێگومان سەلماندنی بەشەکانی تری عەقیدە وەک باوەڕبوون بە پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ و باوەڕ بە رۆژی قیامەت و سەلماندنی ئەو رێبازو رێنموونییە دروستانەی کە پێغەمبەر ﷺ هێناونی، بێگومان ئەم بەشانەی تری عەقیدە جێگیرو پایەدارو دامەزراو نابن، تا بنچینەی یەکەمی عەقیدە دانەمەزرێت کە ئەویش باوەڕ بە بوونی خوا یە.. دەنا کەسێک شک و گومانی لە بوونی خوادا هەبێت و باوەڕی بە هیچ دین و ئاینێک نەبێت و نەیەوێت لەوبارەوە شت حاڵی ببێت، قسەکردن بۆی لەبارەی جوانیو جەماڵی ئیسلام و بێهاوتایی شەریعەتی ئیسلامەوە، بێکەڵک و بێسوودە..

لەناو مامۆستایانماندا هی وا هەیە -وەک: (دکتۆر عبدالحلیم محمود) سەرۆکی گشتی کۆڕی باسە ئیسلامییەکان لە قاهیرەدا- پێی وایە، کە: باوەڕ بە بوونی خوا شتێکی سروشتییەو پێویست بەوەناکات بەڵگەی بۆ بهێنرێتەوە..[12] ئەمە راستە، بەلام ئەگەر بازاڕی شک و گومان برەوی بوو، وە ژەهری گومان بلاوەی کرد، پێویستە بەهەمان چەکی خۆی بەرەنگاری بکەین و لەگەڵ هۆش و سروشتیان دا بدوێین.. ئامانجیشمان -هەروەک گوتم- ئەوەیە: ئەو کۆمەڵە ئیماندارە هۆشیارە چەکدار بکەین، تا بتوانن بەرپەرچی قسەی بێباوەڕەکان بدەنەوە، وە سەرگەردانەکان رزگارکەن و تۆوی گومان لەدڵی گومانداره‌کاندا نەهێلن ..

ئەمە هەڵەیە ئەگەر وا بزانین: قورئان کتێبێکە تەنیا بە هەواڵدان بیروباوەڕ دادەمەزرێنێ، هەروەک لەناو خەڵکیدا بلاوبووەتەوە کە بەڵگە بە

---

[11] قطر : میرنشینێکە لەمیرنشینەکانی خەلیج .

[12] لەکتێبی (الإسلام والعقل) وە نامیلکەی لەبارەی (الإیمان)ەوە.

ئایەتەکانی قورئان دێنینەوە چونکە دەلیلی نەقلییە، لە بەرانبەر دەلیلی عەقلییەوە..
نەخێر، لەبارەی حەقیقەتە گەورەکانەوە، قورئان تەنیا بەخەبەرو هەواڵدان وازی نەهێناوە، بەڵکو بەشوێن هەواڵەکەدا بەڵگەی روون و ئاشکرای هێناوەتەوەو گومانی لێدوورخستۆتەوە، بە جۆرێک قەناعەت بە ژیریو عەقڵ بکات و سروشتیش رازی بکات..
بەڵێ، دەبینین لەبارەی بوونی خواوە قورئان بەو جۆرەیە، وە لەبارەی خوا بەیەک ناسین و وەحیو پەیام (رسالة) و زیندووبوونەوەو پاداشتی پاشەڕۆژیشەوە هەروایە..
جا منیش لەم بابەت و باسەدا سوودم لە نووسینی زانایانی کۆن و نوێ وەرگرتووە، هەوڵم داوە باسەکە روون بکەمەوەو نموونەی جۆربەجۆری بۆ بێنمەوە، تا زیاتر رۆشن ببێتەوەو باشتر قەناعەت دروست بکات.. لەوانەیە شتێکی تازەم لەم بابەتەدا باس نەکردبێ جگە لە رێک خستن و دابەش کردن و جۆراوجۆرکردنی باسەکەو بەڵگە بۆ هێنانەوەی و پەیوەندی دانی هەموویان بە قورئانەوە، چونکە قورئان هێمای کردووە بۆ بنچینەی ئەو بەڵگانەو رێنموونی کردووین بۆ جۆرەکانی و لە ئایەتە ئاشکراکانیدا ئیشارەی بۆ رێسای ئەو بەڵگانەکردووە..

  

لەسەرەتاوە ئەم باسەم بۆ قوتابیەکانی قۆناغی ناوەندیو دواناوەندی قوتابخانە ئیسلامییەکانی وڵاتی (قەتەر) (قطر) نووسییەوە، چونکە ئەندازەیەکی وایان لەبارەی خوێندنی بیروباوەڕو زانیاری (توحید)ەوە بۆ بڕیار درابوو..
تا ئەو جێگەی من پێی بزانم و ئاگام لێی بێ ئەم جۆرە خوێندنە لەبارەی عەقیدەوە رێڕەوێکی نوێیە لە قوتابخانە دینییەکان و کۆلیجەکانی ئیسلامییو شەریعەت دا چونکە ئەوەی لەم قوتابخانانەدا لەبارەی خوێندنی عەقیدەوە باوبوو، خوێندنی ئەو جۆرو شێوەبوو، کە لەسەردەمەکانی رابووردوودا نووسرابووەوە، وە ئەمانیش هەر بایەخیان بەو بابەتانە دەدا، کە زانایانی پێشین لەو سەردەمانەدا بایەخیان پێدابوو.. لەگەڵ ئەوەدا دەبوا زانایانی سەردەمی نوێ بایەخیان بەو بابەتە فیکرییە تازەو نوێیانە بدایە کە لەسەردەمی خۆمان دا روودەدەن، وە چارەسەریان بۆ بدۆزیایەتەوە، وە زانستیو زانیاری نوێیان بۆ خزمەتی عەقیدە بەکار بهێنایە..
جا وام بەباش زانی ئەم باسە بلاوبکەمەوە، پاش ئەوە کە شتێکم لێ زیادکردو هەندێکم دایەپاڵیو بژارێکم تیا کرد.. هیوادارم خوای گەورە بەسوودی بکات بۆ عەودالانی راستەقینە بەگشتیو قوتابیانی قوتابخانە ئیسلامییەکان بەتایبەتی -
هیوادارم خوا یارمەتیدەرم بێت - .

یوسف القرضاوي

# بوونی خوا

## ( بوونی خوا لەزوور هەموو دەمەقاڵەو گومانێکەوەیە )

بێگومان بوونی خوا یەکەمین راستەقینەو گەورەترین و دیاریترینیانە، بەڵگەش بۆ ئەوە سروشت و ژیریو دڵی بینایە، وەحی و زانیاریو مێژوویش بۆ ئەو مەبەستە رێپیشاندەرن..

ئەوانەێ کە لەبارەی بوونی خواوە دەمەدەمێ دەکەن، لەهەموو سەردەمێکدا کەمێکی داپۆشراون، وە بەشی زۆریان ئارەزووەکانی راپێچی کردوون و دنیا خۆش ویستن زاڵ بووە بەسەریانا، نزم بوونەوەیان و کەچرەوییان بە بێباوەڕی و ئینکاری کردنی بوونی خوایگەورە پینە دەکەن.. تا کەسێک نەبێت لێیان بپرسێتەوەو بیانکاتە بەر پرسیار، تا خۆیشیان لەبارەی تلێربوونەوەو رۆچوون و لە هەواو هەوەس و ئارەزواتی ئاژەڵییاندا خۆیان نەکەنە بەرپرسیار!!

هیچ سەیر نیە کەهەندێ هۆشیاران لەبارەی بێباوەڕی ئەوجۆرە کەسانەوە بڵێن: ئەوانە کۆیلەی ورگ و عەورەتن!! نەک بەگەڕخەری ژیریو هۆش.. واتە: لەپێشا خاوەبنەوەو ئینجا دەوتوێنەوەو پەتی بەندایەتی لە ملی خۆیان دادەماڵن، دوایی دەبنە بێباوەڕ!! بەپێی روونکردنەوەی زانایانی دەروون ناسی ئە و جۆرە کەسانە، بێئەوەی هەستی پێبکەن فێڵ لە خۆیان دەکەن، تا کەچ رەوی لەرێترازانی خۆیان بەچاک پیشان بدەن!! وە بۆ بەرگری‌کردن لەو تلێربوونەوەو هەڵخلیسکان و رەوشتە رەشەیان، وە بۆ سەرپۆش دان بەسەر لاوازیو بێدەسەڵاتیان دا لەبەرامبەر هەواو هەوەس و ئارەزووەکانیانەوە پەنایان بردۆتە بەر بێباوەڕیو ئینکاری کردنی خوای تەعالا..

هەر هۆی ئەوەش بوو، کە: هەوڵی پێغەمبەران بۆ ئەوە نەبووە کە بوونی خوا بسەلمێنن، چونکە ئەو میللەتانەی وان باوەڕیان بە بوونی خوا هەبوو، بەڵکو گەورەترین هەوڵی پێغەمبەران ﷺ بۆ پاڵفتەکردنی باوەڕی قەومەکانیان بوو لە چڵکی بت پەرستیو پۆخڵیو ئەو هاوبەشی پەیداکردنەی کە عەقڵ و هۆشیانی تێک دابوو، وە کردبوونیە بەندەی هەندێ لەو شتانەی خوا بۆی رام کردبوون و کردبوونیە گەورەو سەراریان..

بەڵێ، گەورەترین هەوڵ و تێکۆشانی پێغەمبەران ﷺ بانگ کردنی خەڵکی بوو بۆ خوا بەیەک ناسین، وە یەکەم داخوازیو داوای پێغەمبەران ﷺ لە خەڵکی، وە زەقترین شتێ کە خەڵکیان بۆ بانگ دەکرد، ئەمەبوو: ( یاقوم

اعبدوا الله مالکم من إله غیره..) [13] خزمینه، تەنیا خوا بپەرستن، جگە لەو هیچ خوایەکی ترتان بۆ نییە.. یا دەیان فەرموو: (... اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت...) [14] واتە: خوا بپەرستن و لە تاغووت بەدووربن..

خوای تەعالا کاتێک پێغەمبەر ﷺ نارد، دیتی قەومەکەی -وەک هەموو میللەتانی تر- هەندێ لەدروست کراوەکانی سەرزەوی ونەستێرەو قەوارەکانی ئاسمان دەپەرستن، بەخەیاڵی خۆیان خوایش دەپەرستن!! لەگەڵ ئەوەدا ئینکاری بوونی خوایان نەدەکردو لەو بارەوە دەمە دەمێیان نەبوو.. ئەمەش حەقیقەتێکەو وقورئان لە روونترین شێوەدا باسی دەکات و دەفەرموێت: ( ولئن سألتهم : من خلق السموات والأرض؟ لیقولن : الله..) [15]، واتە: خۆ ئەگەر لێیان بپرسیت: کێ ئاسمانان و زەوی دروست کردووە؟ دەڵێن: اللـه!!

خۆ ئەگەر لەوێدا دەستەیەکی کەمی بێبڕوا هەبووبێ قورئان هیچ کێش و نرخێکی بۆ دانەناون و بایەخێکی بە بوونیـان نەداوە، چونکە ئەوانە بەرەنگاری شتێکی زۆر روون و ئاشکرای وادەکەن کەلەلای هەستی مرۆڤ دا غەریب و نامۆ نییە.. لەبەرئەوە دەبینین رووی قسە ناکاتە بێباوەڕان، بەڵکو رووی قسەی زیاتر لەوانەیە کە هاوەڵیان بۆ خواداناوە هەر بۆیەش یەکەم ستوونێ: لەپەیامی ئیسلام دا (واعبدوا الله ، ولاتشرکوا به شیئا)، [16] واتە: خودا بپەرستن و هیچ شتێک مەکەنە شەریک و هاوبەشی.

وە هەروەها پەیامی پێغەمبەر ﷺ بۆ پاشاو دەسەڵات دارانی رووی زەوی لەم ئایەتەدا خۆی دەنواند: (.. تعالوا إلی کلمة سواء بیننا وبینکم: ألا نعبد إلا الله، ولا نشرك به شیئا، ولا یتخذ بعضنا بعضا أربابا من دون الله..) [17] واتە: قسەیەک لە نێوان ئێمەو ئێوەدا هاوبەشە، وەرن با یەک بین لەو قسەیەدا، با هیچ پێتێک نەپەرستین جگە لە اللـه، وە هیچ شەریک و هاوەڵێکی بۆ دانەنێین، وە هەندێکمان عەبدایەتی هەندێکی ترمان نەکەین و یەکتر نەکەینە خواو جگە لەو هیچ کەس بەخوانەزانین..

---

[13] سورەتی (الأعراف) ئایەتەکانی ٥٩، ٦٥، ٧٣.
[14] سورەتی (النحل) ئایەتی ٣٦.
[15] سورەتەکانی (لقمان) ئایەتی ٢٥، وە (الزمر) ئایەتی ٣٨.
[16] سوورەتی (النساء) ئایەتی ٣٦.
[17] سوورەتی (آل عمران ) ئایەتی ٦٤.

## هۆی بێباوەڕی لە ئەوروپادا

لەسەدەی نۆزدەهەمی میلادیداو بگرە پێشتریش، باروودۆخێکی تایبەت بەسەر ئەورووپای مەسیحیدا تێپەڕی.. کە بووە هۆی ئەوە بەشێکی زۆر لە رۆشنبیرانی ئەو ناوچەیە باوەڕیان بە دین و ئایین نەمێنێ، وە ئینکاری بوونی خوا بکەن، یا گومانیان لە بوونیا بۆ دروست ببێ.. بەڵام لەراستیدا ئەوان کافر نەبوون بە خوای راستەقینەو لەئایینی راستەقینە لایان نەدا، بەڵکو کافربوونیان بە خوای کەنیسەبوو، وە لە ئایینی کەنیسەی رۆژئاوا لایان دا..

کەنیسە لەئەورووپادا ئەمە هەڵوێستی بوو: کە پشتگیری تاریکی بکات و لەدژی رووناکی بجەنگێ!! پشتگیری نەفامیی دەکردو شەڕی لەگەڵ زانیاریدا دەکرد، پشتگیری دەرەبەگی دەکردو دژی جووتیار دەجەنگی، لایەنگیری پاشاو کاربەدەستەکانی دەکردو شەڕی لەگەڵ میللەتاندا دەکرد، پشتگیری خەرافاتی دەکردو دژی بیروهۆش دەوەستا.تاد، کاتێ ئەو شۆڕشانەش بەرپاکران کە داوای ئازادیو یەکسانیان دەکرد، پیاوانی ئەو شۆڕشانە هاواریان دەکرد: (بە ریخۆڵەی دوایین کەشیش دوایین پاشا بخنکێنن)!!

لەو رۆژگارەدا کەنیسە حوکمی کوشتنی هەزارەها زاناو رۆشنبیران و هۆشمەندانی دەرکرد، حوکمی دەدا لەشیان بە بزمار بسمن، بەڵکو دوای مردنیش دەست بەرداریان نەدەبوون، محاکەمەی لاشەکەیانی دەکرد، بەڵێ، کەنیسە بەناوی دینەوە ئەم کارانەی دەکرد، بەناوی خواو بەناوی عیسای مەسیحەوەئەو تاوانانەی ئەنجام دەدا!!

کاتێ ئازادبیران و ئەویندارانی زانیاری ئەوەیان دی، کافربوون بەو خوایەی کەنیسەو پیاوانی کەنیسە نوێنەرایەتیان دەکرد، کافربوون بە خوای کەنیسەو باوەڕیان بە زانیاری هێنا..

گەورەترین شتێ کەبووە هۆی دوورکەوتنەوەو دوورەپەرێزیی خەڵکی لە دین، خراپی پێشەوایان و لەرێلادانی هەڵگرانی ئایین بوو!! بە تایبەت ئایینێک کە لەرێگەی چینێکی تایبەتەوە نەبێ، نەهێڵێ خەڵکی خوا بناسن، یا پەیوەندی پێوەبکەن، یا لێی بپاڕێنەوە. خواناسیو پەیوەندی بە خواو لێپاڕانەوەی دەبێ لەرێگەی ئەو چینە تایبەتەوەبێ، کە پێیان دەگوترێ(پیاوانی ئاینی)، جا ئەگەر ئەو چینە تایبەتەش خراپ بوون، ئەوا خەڵکی بەجارێ لادەدات،- ئالێرەدابوو، کە خەڵکی ئەورووپا لەدین لایان دا، چەندەها رێڕەوو رێباز پەیدابوون، فەلسەفەی بوونەکەیان لەسەر هەست و ماددە بوو، هەرشتێ ماددە نەبوایەو بەرپەکێ لە

هەستەکان نەکەوتایە ئینکاریيان دەکرد، باوەڕیـان بـە (غیبیـات) نـەبوو، نـەیان دەسەلماند کە خواو وەحيو فریشتەو دوارۆژوبەهەشت و دۆزەخ بوونی هەبێ!!
بێبڕوایيو ئینکاری بوونی خوا لە ڕێڕەوی (مارکس)یدا گەیشتە لووتکـە، ئەو ڕێڕەوەی کە قسەکەی _(نیتشە)ی کردە جگەرگۆشەی خۆی، کە دەڵێت: ( دین تریاکی میللەتانە) یا ئەو قسـەیەی غـەیری ئـەوان کـە پێیـان وایـە: (قیامـەت و دوارۆژ جگـە لـە چـاوورِاوێکی دەستکردی دەولەمـەندان و ئـەدیبان بـۆ سـەرگەرم کردنی هەژارو چەوساوەکان شـتێکی تـر نییـە، بەناز و نیعمـەتی بەهەشـت دەیـان خەڵەتێنن، تا خۆشی دنیا تـەنیا بـۆ خۆیـان بـێ)!! وە لـەوبارەوە کـارڵ مـارکس گوتوویە: ( خوا ئینسانی دروست نـەکردووە، بـەڵکو ڕاسـتتر ئەوەیـە کـە ئینسـان خوای دروست کردووە)!!

## پڕیشکی بێباوەڕی دەگاتە ڕۆژهەڵات

کاتێ بیروبۆچوونی ڕۆژئاوایی بەرەو وڵاتانی عەرەبيو ئیسلامیی خێشـکەی کـردو هێرشـی هێنـاو شـەپۆلی بێبـاوەڕی ئـەورووپا پڕیشـکی کەوتـە جیهـانی ئیسلامییەوە، ئیستیعمار دیتی لەناو ڕۆڵەی[18] موسوڵمانانـدا کەسـانێکی وا هـەن کەلەبارەی بوونی خواوە گومانیان هەبێ، یا دەمەدەمێو دەمەقاڵەی تیـا بکـەن.. وە هـەندێکیان لەوانـەن کەلـە زانکۆکـانی ڕۆژئـاوا دەرچـوون و لەبەردەسـت مامۆستاکانی ئەوێدا خوێندنیان تەواو کردووە..
وە هەندێکیشیان لەوانەن کە -لەم دواییـەدا- پڕوپاگـەندەی کۆمۆنـیزمیو مارکسـیزمی کـاری تێکـردوون، ڕۆژئاواییـەکان چییـان بـە ئاینەکـەی لای خۆیـان دەگوت، ئەو دوو تاقمەش هەمان ئەواریان لێدەدایەوەو کتومت لاسـایی ئـەوانیان دەکردەوە، لەگەڵ ئەوە کـە بەئاشـکرا جیـاوازی لـە نێـوان ئیسـلامی ڕۆژهـەڵات و مەسیحیەتی ڕۆژئاوادا بەدی دەکرێ..
ئەو دەستەو تاقمانە پێیان وابوو: خۆیان نوێخوازو ڕۆشنبیرن، لـە واقیـع دا لاسایيکەرەوەو چاولێکەربوون، بیرکردنەوەیان بیرکردنەوەی مێشکی خۆیان نەبوو، بەمێشکی ڕۆژئاواییەکان بیریان دەکردەوە، بیرو بۆچوونی سەدەیەک یا دوو سـەدە لەمەپێشی تاقمێ لە ڕۆژئاواییـەکانیان دووبـارە دەکـردەوە، کـەڕۆژگار بەسـەریا تێپەڕیبوو، کەچی خۆشیان وا پیشان دەدا کە زانیـاری دۆسـت و پێـش کـەوتوون.. لەڕاستیدا ئەوانـە هـەر بـەوجۆرەن، کـە خـوا لـە قورئـان دا باسـیان دەکـات و دەفـەرموێ: (لـەناو خـەڵکیدا کەسـانێک هـەن بێزانیـاریو ڕێنموونـيو کتێبـی نوورانی لەبارەی خواوە دەمەقاڵە دەکەن) ئەمەش دەقی ئایەتەکەیـە: (ومن الناس من يجادل في الله بغير علم ولاهدى ولا كتاب منير) الحج/٨.

---

[18] لەسـەرەتاوە لـەنێوان مەسـیحیـیەکاندا بێبـاوەڕی بڵاوبـووەوە وەک: شـیبلی شمیـل لـە لوبنـان وە شەلۆمی مۆشێ (سلامة موسى) لە میصر، ئینجا پەتاو درمەکە کەوتە نێو موسوڵمانانەوە.

# بەڵگەکان لەسەر بوونی خوا

بەپێی هاتنەخوارەوە بۆ ئاستی ئەو گومانداڕو دوودڵانە، تا لە ئاستی خۆیانەوە بەڵگەیان بۆ بهێنرێتەوە، ئەوانەی لەبارەی عەقیدەی ئیسلامییەوە دەنووسن، ناچاردەبن بە بەڵگە هێنانەوە لەسەر بوونی خوا دەست پێبکەن، تا ئیمان و باوەڕ لەسەر بنچینەیەکی عەقڵی پتەوو بەهێزەوە دابمەزرێ، لەگەڵ ئەوەدا کە بوونی خوا ،کراوەترو روونترە لەوەی پێویستی بەبەڵگەو دەلیل هەبێ..
یا وەک شاعیر دەڵێ: ئەگەر رۆژ پێویستی بەبەڵگەو دەلیل هەبوو، نیشانەی ئەوەیە شتێ نییە لە زەینا (ذهن)دا دروست و ساغ بێ..
دەبێ ئەو بەڵگەو دەلیلانە چیبن، کە ئیمانداران بۆ سەلماندنی بوونی خوا پێشکەشی دەکەن بە گومانداڕو بێباوەڕەکان؟!

## بەڵگەبوونی سروشت ( دلالة الفطرة)

### سروشتی ئادەمیزاد بەڵگەیە

بێگومان یەکەم بەڵگەیەک لەسەر بوونی خوا لەقەوارەی خودی ئینسان دایە، بێگومان ئەوەش ئەو سروشتە (فطرة)یە کە خوا ئادەمیزادی لەسەر دروست کردووە. ئەوەش ئەو هەستە سروشتییە بیناو فراوانەیە کە هەست بەوە دەکات: لە ژوور بوونەوەری سنووردارو کۆتاییهاتووەوە، بوونێکی بێسنووری بێکۆتایی دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێک دا هەیە، تەگبیری هەموو کارێک دەکات، دەکرێتە جێگەی هیواو ترسیشی لێدەکرێ، بەگەورە دەگیرێو نیازیشی بۆ دەبرێ.
ئەم هەست کردنەش هەستێکە هەڵقوڵاوی ناخی دەروونی ئادەمیزادە، هەڵگۆزراوی هەموو قەوارەیەتی، وەنەبێ زادەی تەنیا عەقڵ و هۆشی بێ، یا بەرهەمی (ضمیر)و ویژدانی بێ بەتەنیا، بەڵکو جۆرە هەستێکە بێ فێربوون و تەڵقین و کەسب ئادەمیزاد لەخۆیا دەیبینێو هەستی پێدەکات..
فەیلەسووفی بەناوبانگی فەرەنسەیی (دیکارت) ئەم هەستە سروشتییە بەم جۆرە دەردەبڕێ: (لەگەڵ ئەوەدا کە من هەست بە کەم و کووڕی خۆم دەکەم، هەست بە بوونی زاتێکی کامڵیش دەکەم، دەمبینی ناچارم باوەڕم وابێ کە

رواندنی ئەو هەستە لەزاتی من دا بەهۆی ئەو زاتە کامڵەوەیە، کەهەرچی سیفاتی کەماڵە لەوداهەیە، ئەویش زاتی اللە یە.)

ئادەمیزاد هەتا سروشتی ساغ تر بێو دەروونی پاکتر بێ، پەردەی حیجابی نێوان خۆیو خوای تەنکتر دەبێو چاوی دڵی باشتر دەکرێتەوەو لە کێشی کێشندە (جاذبیة)ی زەوی بەرزدەبێتەوەو لە ئاسمانی رۆح دا پەرواز دەکات، لەوەها کاتێکد ا هەست دەکات کەبوونی خوا هەموو هەرێمەکانی لەش و جەستەی داگیردەکات، وە هەموو قەوارەی بوونی دادەپۆشێت.. هەست دەکات ئاتاجی بە دەلیل و بەڵگەیەک نییە بۆ بوونی خوا، کە ئەو دەلیل و بەڵگەیە بەدەربێ لەقەوارەو دەروونی خۆی، بەڵکو هەست دەکات کە بوونی خوا لەهەرچی شت هەیە دیارو ئاشکراترە، بگرە ئەو دەلیل و بەڵگەیە بۆ هەموو شتێ.. (أولم یکف بربك أنه علی کل شيء شهید) فصلت/٥٢.

واتە: ئایا بەس نییە بۆ خوای تۆ کە بەسەر هەموو شتێک دا ئاگادارە؟

دەگێڕنەوەو دەڵێن: رۆژێک بەیەکێ لە زانایانی دڵنیاو پیاوچاکیان گوت: فلان زانا لەزانایانی عەقیدەو (زانیاری کەلام) هەزار بەڵگەو دەلیلی لەسەر بوونی خوا هیناوەتەوە!! ئەویش لەوەلامدا گوتی: چونکە هەزار گومان لەدەروونیا هەبووە..

ئەمە وەلامی کەسێکە، کە لەدەروونی خۆیا کارەکەی بە جۆرێکیوا روون کردۆتەوە، کە پێویستی بە دەلیل و بەڵگەهێنانەوە نەماوە، بەم جۆرەی کە شاعیر گوتوویەتی: ئەگەر رۆژ پێویستی بەبەڵگە هەبێ، هیچ شتێ نییە لە زیهنا کە دروست و ساغ بێ..

لەیەکێک لە پیاوچاکانیان پرسی: بەچیدا خوات ناسی؟

لەوەلام دا گوتی: خوام بە خوادا ناسیوە. واتە: بەهۆی خودی خواوە خوام ناسیوە.

ئیبن و عەتای سکەندەری (إبن عطاء الله السکندري) بەهەمان واتا -رازو نیازێک لەگەڵ خوادا دەکات و- دەڵێ: (ئەی خودایە، چۆن بۆ بوونی تۆ بەڵگە بەشتێک دەهێنرێتەوە کە بوونەکەی پێویستی بەتۆیە؟! ئایا لەغەیری تۆدا دیاربوون و دەرکەوتنێکی وا هەیە کە بۆ تۆ نەبێ؟ تا ئەو ببێتە هۆی دەرخستن و ئاشکراکردنی تۆ؟ تۆ، کەی ون و نادیاربوویت، تا پێویستیت بە دەلیلێک هەبێت بتدۆزێتەوە؟ تۆ، کەی دوورکەوتوویتەوە تا شوێنەوار هۆی گەیشتن بێ بە تۆ؟!) واتە: تۆ کەی گوم بوویت، تا شوێنەوارت هەڵبگیرێو بەهۆی شوێنەوارەکەتەوە بدۆزرێیتەوە؟!

ئەوەی کە لەباسی بەڵگەی سروشتیدا مەبەستمانە ئەوەیە: لەڕاستیدا ئادەمیزاد خوێنەواربێ، یا نەخوێندەوار، زانابێت یا نەزان، ئەگەر خۆی لە

شوێنەواری ئەو میراتیانە رووت بکاتەوە کە جێماون بۆی، وە هەرچی بە دەوروبەرو کۆمەڵگاکەیەوە دەیبەستێتەوە، لە بیروهۆشی خۆیا بیکوژێنێتەوەو نەیهێڵێ، وە ئەو رێڕەوو مەزهەبەی هەیەتی بیخاتە کەنارەوە ئینجا دەست بکاتە بیرکردنەوە لە خۆیو لە بوونەوەر، بێئەوەی زۆری لێبکرێو ناچاربکرێ، خۆی دەبینێت کە سەری بەندەگی بۆ خوای بەرزو گەورەو بەخشندەو میهرەبانی ئەوی کردووە..

ئەوەی کە بێبەڵگەو پێشەکی ژیربێژی ئادەمیزادی فێرکردووە ژمارەی ١+١=٢، هەر ئەویش فێری کردووە کە خوایەکی هەیەو ناتوانێ دەست بەرداری بێ، -ناتوانێ بێ ئیحتیاج بێ لیی- ئەمەش زانیارییەکی وایە، کە: پێویستی بە دەلیل هێنانەوەو گواستنەوە لە زانراوەوە بۆ نەزانراوو لە پێشەکییەوە بۆ ئەنجام نییە.. بەڵێ پێویستی بەهیچ کام لەمانە نییە[19]..

لەکاتی خۆشیو رابواردن و لەش ساغیو دەوڵەمەندیدا هەندێجار ئەم هەستە سروشتییە خۆی دەشارێتەوەو نایەڵێ ئینسان حەقیقەتی خۆی ببینێ، بەڵام کاتێ ئینسان کەوتە ناو نارەحەتییەوە، ئەو رووکەشە -درۆینەیەی کە سروشتە رەسەنەکەی داپۆشیوە- دەتوێتەوە، ئینسانەکە بە کوڵێ پەشیمانییەوە دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگاریو بەگەردن کەچییەوە هاواری بۆ دەبات و لیی دەپاڕێتەوە..

پیاوێک لەبارەی خواوە لە ئیمام جەعفەری (الصادق)ی پرسی.. ئەویش لەوەڵامدا پێی گوت: ئایا سواری کەشتی بوویت، لە دەریادا؟

[19] لە گۆڤاری (التربية الإسلامية)دا ئیبراهیم نیعمە یاداشتێکی ئەفریقای بەم جۆرە نوسیبوو: کاتێ لە وڵاتی (ئەفریقای مەرکەزیی)دا بووم، بیستم کە ئینسانی وەحشی هێشتا لەم وڵاتەدا ماوە، زۆر بەلامەوە سەیربوو! چونکە وام دەزانی ئینسانی وەحشی حەقیقەتێکی نییەو دروستکراوی خەیاڵە!! ئێمەش هەوڵمان دا بیان بینین، بەڵام چۆن؟ دەوڵەت کەسانێکی لێگرتبوون و رامی کردبوون، ئەمانەی وەک کوێخایەک لەنێوان خۆیو ئەواندا بۆ کاروبار بەکاردەهێنا.. ئێمە دەستەیەک بووین دەوڵەت بەترومبێلێک ناردینیو یەکێ لەو کوێخایانەی خستە تەکمان.

بەڵێ ماوەیەکی زۆر ترومبێل رۆیشت و گەیشتینە ناوچەیەک کوێخا گوتی : دەبێ من خۆم رووت بکەمەوە!! لێمان پرسی بۆ؟ وتی: ئەگەر جل و بەرگم لەبەرابێ لێم نزیک نابنەوەو ناتوانم قسەیان لەگەڵدا بکەن!! ئەم ناوچەیەش جێگای ژیانی ئەوانە.. بەڵێ ، خۆی رووت کردەوە، هیچی لەبەر خۆیا نەهێشت، بەگەڵا مۆزێک باش و پێشی خۆی داپۆشیو رۆیشت.. کاتێ ماشینەکەی ئێمەیان بینی، دەمانبینی هەڵدێن و رادەکەن.. بەڵام چ را کردنێک؟! زۆر خێراو تیژڕەو بوون! زۆر دارەوان بوون، وەک رەشمار بەو دارە ساف ولووسانەدا سەردەکەوتن.. رۆیشتینە خانەو لانەکانیان، ماڵەکانیان زۆر نزم و بچووک بوون، وەک کولانەو کەندڕ وا بوون.. جگە لەچەند پارچە دارێک راخەریان نەبوو، پاش ماوەیەک کوێخا دانەیەکیانی هێناو هاتەوە، هەندێ توتنی دایێ زۆر کەیف خۆش و شادمان بوو، چونکە زۆر حەزیان لە توتنی کاڵ دەکرد!! ئینجا دەست کرا بە پرسیارلێکردنی.. منیش بە تەرجومانەکەم گوت: لیی بپرسێ: کێ تۆو ئەم جەنگەڵەو ئاسمان و زەوییو مانگ و رۆژو ئەستێرەی دروست کردووە؟ ئەویش لیی پرسی، لەوەڵامدا گوتی: چایا.. لەزمانی خۆیاندا چایا یەعنی اللە، یەعنی خوا.

من زۆرم بەلاوەسەیربوو، ئەم ئینسانانە کە هیچ پەیام و شارستانیەتێکی پێنەگەیشتووە، چۆن ئەمەی زانی؟ ئەگەر باوەڕ بە خوا تێکەڵ بە سروشتی نەبێ!! ئەگەر بەهۆی فیترەت و سروشتەوە نەبێ کە خوا ئادەمیزادی لەسەر دروست کردووە؟! ( وەرگێڕ ) .

گوتی : بەڵێ..

گوتی: ئایا جارێک رووی‌داوە بۆت، کە: رەشەبا گێژەڵووکەو تۆفانێک لەدەریادا پێک بێنێ؟

گوتی : بەڵێ..

گوتی: وابووە هیوات بە مەلەوان و کەرەسەی رزگاری نەمابێ؟!

گوتی : بەڵێ..

گوتی : ئەی هاتووە بەخەیاڵتاو داویە بەدەروونتا: کەسێک هەبێت گەر مەیلی لێبێ لەویا رزگارت بکات؟

گوتی : بەڵێ ..

ئیمام گوتی: ئە ئەوە خودایە..

قورئانی پیرۆزیش هێما بۆ ئەم راستەقینەیە دەکات کە دەفەرموێ:

( هو الذي يسيركم في البر والبحر، حتى إذا كنتم في الفلك وجرين بهم بريح طيبة، وفرحوا بها جاءتها ريح عاصف وجاءهم الموج من كل مكان وظنوا أنهم أحيط بهم دعوا الله مخلصين له الدين، لئن أنجيتنا من هذه لنكونن من الشاكرين) يونس/۲۲.

واتە: ئەو خوایە لە وشکانی‌و دەریادا دەتانخاتەرێ، تا کاتێ لەناو کەشتی‌دان و بایەکی شەماڵی پاک دەیان بزوێنێ‌و پێی شادمان دەبن، ئینجا کە بایەکی تووڕەی تۆفانی‌یان بۆ هات و شەپۆل لەهەموو جێگەیەکەوە رووی تێکردن و لێیان رون بوو کە چواردەوریان بەشەپۆلی گەورە گیراوە، زۆر بە دڵسۆزانە هاوار بۆ خوا دەبەن و دەڵێن: ئەگەر تا لەمە ڕزگارمان کەیت سوپاست دەکەین و دەچینە ریزی سوپاس گوزارانەوە ئاوەها دەبنە دینداریکی (مخلص)و دڵسۆز..

قورئان لەوپەڕی جوانی‌دا وێنەی رەسەنیەتی ئەم بیروبۆچوونە دەکێشێ‌و پیشانی دەدات، کە ئەم حاڵە بۆ هەموو تاک تاکێکی ئادەمیزادە، چوار چمکی دڵەکان دەگرێ‌و زۆر لەسەرخۆ بەرەو پەروەردگاریان دەبات، لە وێنەی پەیمانێکی کۆنی نێوان خۆی‌و ئادەمیزاددا پیشانی دەدات.. دەیخاتەوە یادمان کە ئێوەی ئادەمیزاد پەیمانتان داوە: مـن بپەرستن و باوەڕتان بەمن هەبێ‌و هاوەڵم بۆ دانەنێن.. با گوێی بۆ بگرین و بزانین لەو بارەوە چ دەفەرموێت؟

( وإذ أخذ ربك من بني آدم من ظهورهم ذريتهم وأشهدهم على أنفسهم ألست بربكم؟ قالوا: بلى شهدنا، أن تقولوا يوم القيامة إنا كنا عن هذا غافلين، أو تقولوا: إنما أشرك آباؤنا من قبل، وكنا ذرية من بعدهم أفتهلكنا بما فعل المبطلون؟) الأعراف/۱۷۳.

واتە: کاتێ پەروەردگارت پەیمانی لە ئادەمیزاد وەرگرت کە لەجیهانی (ارواح)دا بوون، وە کردنی بە شاهید بەسەرخۆیانەوەولێی پرسین: ئایا مـن پەروەردگاری ئێوە نیم؟

گوتیان: بەڵێ، شایەتیمان داوە کە تۆ پەروەردگاری ئێمەیت.. -ئەم شایەتیەی لێ‌وەرگرتن- تا لە رۆژی قیامەت دا نەڵێن: ئێمە لەو پەیمانە

بێئاگابووین، یان بڵێین: بـاوک و باپـیرانی پێشـینانمان هاوبەشـیان پـەیداکردووەو ئێمەش وەچەو نەوەی ئەوان بووین و دوای ئـەوانیش ئێمـە لەسـەر ڕێـڕەوی ئـەوان ڕۆیشتووین!! ئایا بەهۆی کارێکەوە کـە ناڕاستان ئـەنجامیان داوە، تـۆ لـەناومان دەبەیت؟؟

لە کاتێکدا ئەم هەستە شتێکی سروشتی بوو، هـەروەک بۆمـان دەرکـەوت، دەبینین بنچینەی بـاوەڕ ئـەندازێکی هاوبـەش (قدر مشترك)ە لـە نێـوان هـەموو میللەتان داو لەهەموو ناوچە جۆربەجۆرەکانداو لە هەموو سەردەمەکانی مێژوودا، هەرچەند زۆرێکی زۆریان لـە ئیمـان و بـاوەڕی دروست لایـان داوەو شتی هیـچ و پووچیان لەگەڵدا تێکەڵ کردووەو ڕوونیی‌یەکەیان لێڵ کردووەو کاکڵەکەیان تەماوی -کەڕوودار- کردووە..

لەم بارەوە فەیلەسووفی ناسراو (هێنری برگسۆن) دەڵێ: بێگومان کۆمەڵی ئادەمیزاد بـووەو دەیـش بـێ کـە زانیـاریو هونـەرو فەلسـەفەیان نـەبووبێ، بـەڵام هەرگیز کۆمـەڵانێک نەبوون دین و ئایینیان نەبووبێ..

مێژووناسی ئیغریقی‌کۆن (بلۆتارک) دەڵێ: لە مێژوودا هەیە کـە چـەندەها شار قەڵایان نەبووبێ، یا قوتابخانەیان نـەبووبێ، یـا کۆشـک وتـەلاریان نـەبووبێ، بەڵام چەند شارێک -لە مێژوودا- نەبووە کەبێ عیبادەتخانەبن!!).

ئەوانەی لە مێژووی دینەکان دەکۆڵنەوە، ئەم قسەیە دووپات دەکەنەوە کە: ئادەمیزاد هەرچەند زانیاریو شارستانیەتی هەبێ، ناتوانێ پێویسـتی بـە دیـن و ئیمان نەبێ..

(ڕینان)ی فەیلەسوف لە کتێبەکەی خۆیـا بـەناوی (مێـژووی ئاینـەکان)دا دەڵـێ: دەگونجـێ هـەر شـتێکمان خـۆش بـوێ لـەناوبچێ، بـەکارهێنانی ژیـریو زانیاریو پیشەسازی بەئازادانـە نـەمێنێ، بـەڵام نـەگونجاو (مستحیل)ە دینـداری لەناوبچێو شوێنەواری نەمێنێ![20]، بەڵکو هەردەمێنێو بەڵگەیەکی گۆیـا دەبێت

---

[20] جێگەی خۆیەتی لێرەدا نموونەیەکی (مێژوویی) بخەینە پێش چاو لەگەڵ نموونەیـەک لـەوەی کـە ئەمڕۆ بەچاوی خۆمان دەیبینین :

ا-ڕووداوی ئەندەلس -ئیسـپانیای ئـەمڕۆ- لەسـەردەمی دادگـای پشـکنین دا، (موسـڵمان بـوون) لـە ئیسپانیادا تاوانێکی‌گەورەبوو، هەرکەس وازی لە ئیسلام نەهێنایە یا دەیان کوشت، یا دەیان سووتاند، یا هەڵیاندەواسی، یا چاوهەڵکۆڵین و مەمک بڕین و چەندەها جۆرە سزای‌تر بوەستێ..
ئەم دوژمنایەتی‌یە لەگەڵ ئیسلامدا نزیکەی چوارسەدو پەنجا ساڵی خایاند، کەس نەیدەوێرا بەئاشکرا موسڵمان بێ.. بەڵام کاتێ ژەنەراڵ فرانکۆ مردو دیموکراسی لەوڵاتا بەرپاکرا، زیاتر لە ٧٠٠ خانەوادە خۆیان ئاشکرا کرد کە تا ئێستا دینەکەیان پاراستووەو هەر بە موسڵمانی ماونەتەوە. (بڕوانە محمدی بچکۆل لە نامە کوێستانیەکان)دا.

ب- لەم سەردەمەی خۆماندا یـەکێتی شـوورەوی هـەموو جـۆرە دینێکـی لـەو وڵاتـەدا قەدەغـەکرد، وە چەندەها ملیۆن موسڵمان ئاوارەبوون، یا زیندانی کران، یا شەهید کـران.. بـەڵام، کـاتێ ئـەو پەکهێنە ڕووخاو وە ئاشکراکرا کە هەرکەس هەردینێکی هەیە بە ئازادی دەتوانێ دینەکەی خۆی ببات بـەڕێوە.. موسڵمانان دوای حەفتاساڵ ڕوویان کردەوە مزگەوتەکانیان.

بۆ پووچەڵ کردنەوەی بیرو فیکری ماددی، ئەو بیرە ماددیەی کەدەیەوێ فیکرو بیری ئادەمیزاد لە تەنگەڵانە پەستەکانی ژیانی سەرزەوی‌و ماددیات دا کۆتا بکاتەوەو لە جیهانی میتافیزیک (ماوراء المادة)ی بپچڕێ..

## بەڵگەکانی بوونەوەر

گوتمان: ئەگەر سروشتی ساغ و دروستی مرۆڤ وازی لێبهێنرێ‌و سەری لێ چەواشە نەکرێ، خۆی ڕێگەی حەقیقەت دەدۆزێتەوەو پەی بە بوونی خوا دەبات...

هەروەها ژیری‌و عەقڵیش، ژیری و هۆشی ساغ و دروستیش، ئەگەر لە هەواو هەوەس و چاولێکەری ڕووت بکرێتەوە، بە کەمترین سەرنج دان و بیرکردنەوە، حەتمەن دەگاتە ئەنجامێکی یەقینی‌و پاک و بێ گەرد، کە ئەویش هەست کردنە بە بوونی خوای (عزوجل)..

ئەم بوونەوەرە گەورەیە بە ئاسمانان و زەوییەوە، بە ئادەمیزادو گیاندارانی تریەوە، بە رووەک و بێ گیانیەوە، بە هەموو ئەوانەی لەم بوونەوەرەدا هەن: هەر لە ئەتۆمەوە تا کەهکەشان، هەر لە گیاندارانی یەک خانەییەوە تا بەرزترین جۆری ژیان، بوارێکن بۆ سەرنجدان و بیرکردنەوەی عەقڵ و هۆش.. چونکە ئەوەی سەرنج لەم بوونەوەرە بدات و بیری لێبکاتەوە -ئەوەمان لە بیرنەچێ کە مرۆڤیش بەشێکە لەم بوونەوەرە- *چوار بەڵگەی سەرەکی دێتە دەست، کە ڕێنموونی بکەن بۆ لای پەروەردگاری بەرزو بڵندی- ئەو بەڵگانەش ئەمانەن: ١- بەدیهێنان (خلق). ٢- کارسازی (التسوية). ٣- ئەندازەگیری (التقدير). ٤-ڕێنمویی (الهداية)..*

## بایەخ دانی قورئان بە بوونەوەر (الکون)

بێ گومان ئەگەر خەڵکی بەباشی بیر لە هەرشتێ بکەنەوە، لەم بوونەوەرە گەورەیەداو بە وردی سەرنجی بدەن، دەستیان دەگرێ‌و دەیانبات بۆ لای خواو، بوونی خوایان حاڵی دەکات، بگرە پێیشیان دەناسێنێ کە خوا یەکەو تەنیا ئەویش خاوەنی موڵکی جیهانەو لەژێر چاودێری‌و سەرپەرشتی ئەویش دایەو بەس.. نەک هەر ئەوە بەڵکو ناوە پیرۆزەکانی خوایشیان پێ دەناسێنێ، لەگەڵ سیفەتە بەرزەکانیا..

خودی ئادەمیزاد نیشانەیەکی تاقانایە لەسەر دەسەڵاتی خواو بوونی خوا، ئادەمیزاد خۆی بەتەنیا جیهانێکی تایبەتە، جوانی‌و جەمالی دیمەنی، لەگەڵ هێزی هەست و دەرک و بیناییدا، کۆبوونەوەی ئەم بەهرەو بەشانە لە ئادەمیزادا، مرۆڤی هەڵبواردووە لەهەموو گیاندارێکی تر، چونکە جگە لە خۆی هیچ گیاندارێکی‌تر ئەم سیفەتانەی تیا کۆنەبۆتەوە..

هەر لەبەر ئەمەیشە کە قورئانی پیرۆز مرۆڤ رێنموونی دەکات بۆ سەرنج دان و بیرکردنەوە لە خۆیو جیهانی دەوروبەری، لەوە دڵنیایە کە ئەو سەرنج دان و بیرکردنەوەیە شیاوی ئەوەن رێگەی راستی پێ پیشان بدەن و بەرەو خێروخۆشی ببەن، چونکە دەسەڵاتی خواو توانای پەروەردگار لە خۆیو دەوروبەریا دەبینێو هەستی پێدەکات..

خوای گەورە دەفەرموێت: (لەزەویدا چەندەها نیشانەو بەڵگە -لەسەر بوونی خوا- هەیە بۆ کەسانی دڵنیا، وە لە دەروونی خۆیشتان دا، ئایا سەرنج نادەن و نایبینن؟)[21]

وە (ئایا سەرنج نادەنە مولکی گەورەی ئاسمانان و زەویو وردنابنەوە لەوشتانەی خوا دروستی کردوون؟)[22]

وە (ئایا بیر لە خۆیان ناکەنەوە؟. -باش بزانن- کە دروست کردنی ئاسمانان و زەوی بۆ مەبەستێکی حەققە -و هەوانتەکاری نییە-و تا ماوەیەکی دیاریکراویش پایەداردەبن -دوایی دەپێچرێنەوە- کۆتاییان دێت.)[23]

وە (پێیان بڵێ: تەماشاکەن، -وردببنەوە- بزانن چی لە ئاسمانان و زەویدا هەیە!!)[24] وە بێگومان لە دروست کردنی زەویو ئاسمانان و جیاوازی شەوو رۆژدا وە -بەخشینی حاسیەتێک- بە ئەو کەشتیانەی لە دەریادا دەگەڕێن بۆ سوودگەیاندن بەخەڵکی، وە ئەو ئاوەی خوا لە ئاسمانەوە دەیبارێنێو خاکی مردووی زەوی پێ زیندوو دەکاتەوە، وە هەموو جۆرەگیاندارێک کە لەزەویدا بڵاویکردونەتەوە، وە گۆڕاندن و گۆڕینی (با)کان، وە رام کردنی ئەو هەورەی لە نێوان ئاسمان و زەویدایە، هەموو ئەمانە نیشانەو بەڵگەن -لەسەر بوونی خوا- بۆ ئەوانەی عەقڵیان بەکار بێنن)[25].

وە ئەوە تەماشای ئەو ئاسمانانەی لای سەرووی خۆیان ناکەن، کە چۆنمان دروست کردووەو رازاندوومانەتەوەو بێ ئەوەی دەربەندێکی تیابێ؟ -ئایا سەرنج نادەنە- ئەو زەوییەی کە درێژەدارمان کردووەو رامان خستووەو کێوانمان تیا هاویشتووەو لەهەموو جووتێ رووەک و گیامان تیا رواندووە؟ -هەموو ئەمانە- بەرچاو رۆشنیو یادخستنەوەن، بۆ هەرکەسێ بیەوێ بگەڕێتەوە بۆ لای خوای خۆی).[26]

---

[21] سوورەتی الذاریات ئایەتی ٢٠،٢١.

[22] سوورەتی الأعراف ئایەتی ١٨٥.

[23] سوورەتی الروم ئایەتی ٨.

[24] سوورەتی یونس ئایەتی ١٠١.

[25] سوورەتی البقرة ئایەتی ١٦٤.

[26] سوورەتی ق ئایەتەکانی ٦-٨.

قورئان بەشێکی زۆر لە رواڵەتەکانی بوونەوەرمان دەخاتە پێش چاو، لە ئاسمان و زەویدا، ئینجا دوا بەدوایان دەفەرموێ: (ئا لەوەدا نیشانە -ی بوونی خوا- هەیە بۆ کەسانێک بیری خۆیان بخەنەکارو بیربکەنەوە) یا (بۆ کەسانێک عەقڵیان بەکار بێنن) یا (بۆ کەسانێک بیانەوێ راستەقینەیان یادکەوێتەوە)[27]..

قورئان سەرزەنشتی کافران دەکات لەسەر ئەوە کە عەقڵ و هەستی خۆیان داخستووەو بۆ نیشانەکانی خوا سوودی لێوەرناگرن، ئەوەتە دەفەرموێ: لە ئاسمانان و زەویدا چەندەها نیشانە -لەسەر بوونی خوا- هەیە؟ -کەچی- بەسەریا دەڕۆن و پشتی تێدەکەن -و بیری لێناکەنەوە-)..[28]

بە زۆری دەبینین ئایەتەکانی قورئان بەم جۆرە کۆتاییان پێهاتووە:

(ئەوە بۆ ژیر نابن؟) (ئەوە بۆ عەقڵتان بەکار ناهێنن؟)[29] (ئەوە بۆ نابیستن؟) (ئەوە بۆ نابینن))-[30].

لەم باسەوە حاڵی دەبین کە بۆچ قورئان لەزۆر شوێنا سوێند بە دروستکراوان و رواڵەتەکانی بوونەوەر دەخوات؟ دەیەوێ بەوانە دڵی نووستووەکان ئاگاداربکاتەوە، سەرنجی ئەو عەقڵانە رابکێشێ کە پشت هەڵدەکەن، هەر لەبەرئەوە سوێند دەخوات بە شەوو رۆژو بەیانیو چێشتەنگاوو خۆرو مانگ و ئەستێرەو دەریاو ئاسمان و زەویو جووت و تاک و ئەوەی دەیبینین و ئەوەش بۆمان نابینرێت..

## چوار بەڵگەکانی بوونەوەر

*ئەوەی سەرنجی ئەم بوونەوەرە -بەئادەمیزادیشەوە- بدات، چوار بەڵگەی سەرەکی بەدەست دێنێ، کە ئەم بەڵگانەش رێنموونی دەکەن بۆ لای خوا.. بەڵگەکانیش ئەمانەن: بەدیهێنان، یەکسان بوون، ئەندازەگیری، رێنموونی..*

### ١- بەڵگەی بەدیهێنان (الخلق)

بەڵگەی بەدیهێنان دروستکردنیشی پێدەگوترێ، مەبەست لە (خلق) پەیداکردن و بەدیهێنانە.. واتە: دەرخستنی شت لە نەبوونەوە بۆ بوون.

ئەوەش وەک دروستکردنی ژیان لەهەموو جۆرە گیاندارێک دا: لەو زیندەوەرانەی بەسەر زەویدا بڵاویکردوونەتەوە، یا ئەو رووەکانەی کە لە هەموو جۆرێک جووتێکی قەشەنگی لێ رواندوون، وە وەک ئەو ئادەمیزادە عاقڵەی کە

---

[27] سوورەتی النحل ئایەتەکانی ١١،١٢،١٣.

[28] سوورەتی یوسف ئایەتی ١٠٥.

[29] سوورەتی الأنعام ئایەتی ٣٢.

[30] سوورەتی السجدە ئایەتی ٢٦، ٢٧.

لەوەپێش ناوی نەبووەو ئێستا هەیەو بووە.. لەیەکەم سوورەتێکی قورئاندا، کە خوا ناردی بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ لەم بارەوە ئاگادارمان دەکاتەوەو دەفەرمویت: ( إقرأ باسم ربك الذي خلق ، خلق الإنسان من علق )[٣١] ، واتە: بخوێنە بەناوی ئەو پەروەردگارەتەوە کە بەدیهێنەرە، ئادەمیزادی لە پارچە خوێنێک بەدیهێناوە.. وەک دروست کردن و بەدیهێنانی ئاسمان و زەوی کە لە دروست کردن و بەدیهێنانی ئینسان گەورەترو هێژاترن.

زانیاری گەردوون ناسی نوێ، لە گەورەیی ئەو قەوارە (جرم) بەرزانەو فراوانی نێوانیان شارەزامان دەکات، بە جۆرێک ماوەی نێوانیان فراوانە کە بە ملیۆنەها ساڵی تیشکی دەپێورێن!!

ئەری کێ ئەو ژیانەی لەسەر زەویدا بەدی هێنا؟ دەبێ کێ بەدیهێنەری ئەو مرۆڤە ژیرە خاوەن بیروبۆچوونە بێ؟ کێ هەموو ئەم بوونەوەرەی بە زەوی‌و ئاسمانەکانیەوە بەدی هێنابێت؟ ئایا ژیان و ئادەمیزادو دروستکراوەکانی‌تر بەبەرزو نزمیانەوە، بێ بەدیهێنەرێک و هەر لە خۆیانەوە پەیدابووبن؟ یا پێویستە دروست کەرو بەدیهێنەرێکیان هەبێت؟ دەبێ ئەو بەدیهێنەرە کێ بێت؟..

ئەوانەی بێباوەڕن، لەبارەی پەیدابوون و دەرکەوتنی ژیان لە یەکەم جاردا ، لەم ئەستێرەیەی زەویدا چی دەڵێن؟

- دەڵێن: لە ماددەوە پەیدابووە، بەڵام- دەرکەوتنی ژیان لەماددەی کەڕو کوێرەوە، ماددیەکانی خستۆتە ناو گێژاو (مشكلة)یەکەوە، کە نەتوانن چارەسەری بۆ بدۆزنەوە، تا ئێستا نە چارەسەریان بۆ دۆزراوەتەوەو نە بۆیشیان تەفسیر دەکرێت، جگە لەو شێوەی کە شاعیر باسی دەکات و دەڵێت: بەدرێژایی شەو سەرزەنشتی بیری خۆی دەکات : کەچی دوای زەحمەتێکی زۆر تەفسیری ئاو بە ئاو دەکات ..

بۆ نموونە، هەندێک لە ماددیەکان، لەبارەی تەفسیری پەیدابوونی ژیانەوە لە ماددەی کەڕوکوێر، گوتوویانە: بەهۆی نیازکێکی سەرلێشێواوی بۆشاییەکانی ئاسمان، ژیان لە جیهانی باڵاوە کەوتە سەرزەوی.. بەڵام ئەم پرسیارە خۆی قیت دەکاتەوە: ئەدی لە جیهانی باڵاو گەردوون دا یا لەهەر ئەستێرەیەک لە ئەستێرەکان دا کێ ژیانی بەدی هێنا؟!

هەندێکی‌تر گوتوویانە: لە ماددەدا سروشتی ژیان (طبيعة الحياة) هەیە، ئەویش پاش ئاوێتەکردن و یەکخستنێکی تایبەت، بەڵام دووبارە ئەو پرسیارە خۆی دێنێتە پێش: کێ ئاوێتەی دەکات و یەکی‌دەخات؟ لەگەڵ ئەوەدا کە خۆی ماددەیەکی کەڕی کوێرەو ئەو کارەی لێ‌نایەت؟!

---

[٣١] سوورەتی العلق ئایەتی ١-٢.

عەقڵ و ژیری ناچارە لەبارەی پەیدابوونی ژیانەوە یەکێک لەم دوو قسەیە بەراست بزانێ: ١-(پەیدابوونی ژیان، یا تایبەتێکە لە تایبەتیەکانی ماددەو لێی جیانابێتەوە، ئیتر پێویستی بە بەدیهێنەرێکی خاوەن ویست نی‌یە)! ٢- یا (پەیدابوونی ژیان، دەستکردی بەدیهێنەرێکی خاوەن ویستەو دەشزانێت چی ویستووە؟).. واتە: ماددە یا خۆی خالقی خۆیەتی، یا خوا خالقیەتی؟..

ئەگەرجیهان هەمووی بریتی بێت لە ماددەو جگە لە ماددە شتێکی تری تیا نەبێت، دەبێت ماددە (ئەزەلی) و (ئەبەدی) بێت، وە سەرەتاو کۆتایی بۆ نەبێت و هەر لە ئەزەلەوە بەتەواوی هێزیەوەو بەگشت تایبەتیەکانیەوە بووبێت و لەهەرکوێ بێت ئەو تایبەتیانەی هەیەتی لێی جیا نەبێتەوە، بێ جیاوازی لەنێوان ماددەیەک لەفەزاداو ماددەیەکی‌تر لەم بوونەوەرەداو ماددەیەکی تریش لە شوێنێکی‌تردا..

جا ئەگەر وابێت، پەیدابوونی ژیان لەئەستێرەیەکداو نەبوونی لە ئەستێرەیەکی تردا، وە بوونی لەسەردەمێک و نەبوونی لەسەردەمێکی‌تردا، بێواتاو بێ مەعنا دەبێت.. هیچ مەعنایەکی نییە، ئەگەر تایبەتیەکانی ژیان مەلایین و ملیۆنەها ساڵ-بگرە لە مەلایین و ملیۆنیش زۆرترو زیاتر لە حسابی ساڵەکاندا- بەردەوام بێکاربن و ، کەچی دوای ئەوە لەسەردەمێک دا بکەونەکارو ژیان بەدی‌بێنن کە بەحسابی هەزاران ساڵ مێژووەکەی حسێب بکرێ.. شتێکی ئاشکرایە کە حسێبی هەزاران و ملیۆنەها ساڵ لە بەرامبەر ئەزەلەوە قیاس ناکرێت..

ئەم پرسیارە راست دەبێتەوە: بۆچ لەم هەموو سەردەمانەدا کە لەژمارە نایەن، تایبەتییەکانی ژیان دواکەوت؟! بۆچ دابەشکردن و پێکهێنان لە پارچەکانی بوونەوەر و لەسەردەمەکان دا جیاوازبوو؟ ئەم ژیانە بۆچ بەرێکەوت پەیابوو؟ ئینجا ئەم رێکەوتەش هەر بەردەوام بوو؟ کە هەریەکەیان بگری پێویستی بە تەگبیر هەیە، خۆ ماددەی کەرِی کوێریش توانای تەگبیری نی‌یە..

ئەگەر عەقڵ قایل بێ بەوە کە ژیان بەرهەمی ماددەیەو خالقێکی نییە، وە رێزی ئەم بۆچوونەش بدات بەسەر ئەو بۆچوونەدا کە دەڵێت: ژیان بەهۆی خالقێکی دانای بەتواناوە بەدی‌هاتووە، ئەگەر رێزی بۆچوونی یەکەم بدات بەسەر بۆچوونی دووەم دا، دەبێ هۆیەکانی ئەم رێزدانەی روون بکاتەوە.. هیچ هۆیەک پێ‌نازانین بۆ رێزدانی بۆچوونێکی ئەزۆک و زەحمەت بەسەر بۆچوونێکی پڕ بەرو ئاسان دا..

بۆچوونی یەکەم ئەوەبوو ماددەی کەرِوکوێر ژیانی بەدی‌هێنابێت، وە بۆچوونی دووەمیش ئەوەبوو کە بەویستی خالقێکی زاناو توانا ژیان بەدی هاتبێت.

تەنیا بۆچوونی دووەم کە بۆچوونێکی سووک و ئاسانە دەتوانێت مەتەڵی پەیدابوونی ژیان لەماددەی کەرِوکوێر هەڵبێنێت.. مەتەڵی پەیدابوون و هاتنەدەرەوەی زیندوو لە مردوو.. کاتێک مرۆڤ وەڵامی دەنگی ژیری بداتەوە،

بەدەم دەنگی ناشکراو بەڵگەنەویستەوە بچیت، وە خوا بە خالیق و بەدیهێنەری هەموو شتێک بزانیت، تەواوی مەتەڵەکانی بوون (وجود)و بوونەوەری بۆ حەل دەبیت..

(بێگومان خوا دەمی دەنک و ناوکە دەکاتەوە، زیندوو لە مردوو پەیا دەکات، وە مردوویش لە زیندوو دەردەکات، ئەئەوە خوای ئێوەیە ئیتر بۆچ بوختان دەکەن)[٣٢] ( پاکیی‌و بێگەردیی بۆ ئەو خوایە کە هەموو جووتەکانی دروست کردووە لەوەی زەوی سەوزی دەکات و لەوەی دەروونی خۆیان و لەوەش کە ئێستا نایزانن)[٣٣] .

ئەم بەڵگەیە ناودەبرێ بە بەڵگەی ( دروستکردن)، یا (پەیداکردن) یا (بەدیهێنان)..

جاری وا هەیە هەر ئەم بەڵگەیە لەوێنەیەکی تردا خۆی پیشان دەدات، ئەو کاتە پێی دەگوترێت: بەڵگەی بزوتنەوە (دليل الحركة).. جا ئەو بزووتنەوەیە بەواتای گواستنەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی‌تر بێت، یا گۆڕان بێت لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر، یا بزووتنەوە بە واتای گواستنەوە بێت لە خەیاڵەوە بۆ واقیع، یا لە ئیمکانەوە بۆ وجوود).[٣٤]

ناوەڕۆکی ئەم بەڵگەیەش بریتی‌یە لەوە: هەموو بزووتنەوەیەک، پێویستە بزوێنەرێکی هەبێت، وە ئەو بزوێنەرەیش، دەبێت بزووتنەوەکەی لەغەیری خۆیەوە بەدەست بێنێت، وە هەروەها دەڕوات، تا عەقڵ رادەوەستێ، لە بەرامبەر بزوێنەری سەربەخۆی ئەزەلییەوە، ئەو بزوێنەرەی کە پێویستی بەغەیری خۆی نییە.. دەنا دەورو () تەسەلسولی () بێکۆتایی روودەدات، دەورو تەسەلسولیش هەردووکیان بەتاڵن.. ئەو بزوێنەرە سەربەخۆیەش کە پێویستی بە غەیری خۆی نییە زاتی (اللـه) یە ..

زانایانی (کەلام) لە وێنەیەکی سێهەم دا ئەم باسەیان پێشکەش کردووەو بەناوی بەڵگەی پەیدابوونی (دليل الحدوث) ناویان بردووە.. بەڵگەکەش بەم جۆرەیە، گوتوویانە: جیهان لە گۆڕاندایە، هەرشتێکیش لە گۆڕاندابێت پەیدابووە، وە

---

[٣٢] نایەتی ٩٥ لە سوورەتی الانعام: (إن الله فالق الحب والنوى يخرج الحي من الميت ومخرج الميت من الحي، ذلم الله فاني تؤفكون).

[٣٣] سوورەتی (يس) نایەتی ٣٦: (سبحان الذي خلق الأزواج كلها مما تنبت الأرض ومن أنفسهم ومما لايعلمون).

[٣٤] بۆ نموونە کەریم دەڵێ: مومکینە من کوڕێکم ببێ‌و ببێتە زانا، محەمەدیش دەڵێ: من ئێستا کوڕێکم هەیە زانایە. جیاوازی لەنێوان ئەم دووەدا زۆرە، چونکە هەڵدەگرێ کەریم هەر کوڕی نەبێ، وە ئەگەر بوویشی مومکینە زانا نەبێ.. بەڵام محمد (بالفعل) کوڕێکی زاناو عالمی هەیەو ئیحتیمال و هەڵدەگرێی بۆ داهاتوو نەهێشتۆتەوە. هی یەکەم وجودی نییە، بەڵام لە دووەمدا وجوودی هەیە، ئەوە نموونەی (امكان) و (وجود)ە.

هەموو پەیدابوویەکیش پێویستی بەپەیداکەرێک هەیە. ژیری دەڕوات، تا لە ئەنجام دا لەبەرامبەر پەیداکەرێکەوە رادەوەستێت، کە بێئیحتیاجەو پێویستی بە پەیداکەر نەبووە، دەنا دەورو تەسەلسولە مەحالەکان روودەدەنەوە، وە ئەو پەیداکەرەیش کە پێویستی بە غەیری خۆی نییە زاتی (اللە)یە.

زانیاری نوێیش ددان بە پەیدابوونی جیهاندا دەنێت ، بەپێی خەملاندنی خۆی، دەیگێڕێتەوە بۆ چەند ملیۆن ساڵێک.

وە فەیلەسووفە ئیسلامییەکانی وەک: (فارابی)و (ابن سینا) بە شێوازێکیتر پێشکەشیان کردووەو بە (دلیل الإمکان) ناویان بردووە..

پاڵفتەی ئەم بەڵگەیەش بەم جۆرەیە: بەپێی دابەش کردنی عەقلی، ئەو شتانەی هەن و (موجودات)ن، یا هەموویان (واجب الوجود)ن (واجب الوجود)یش بەوە دەڵێن کە: عەقڵ (تصوری) نەبوونەکەی بۆ نەکرێ. چونکە نەبوونەکەی مەحاڵە..

یا هەموویان بوونەکەیان (ممکن)ە، واتە: دەگونجێ ببێ، یان نەبێ، بوون و نەبوونی چون یەکە. هۆیەکی خۆیی (علة ذاتیة) نیە کە داوای بوون یا نەبوونی بکات..

یا هەندێکیان بوونەکەیان (واجب)ەو هەندێکی تریشیان (ممکن)ە..

پاش ئەوە کە ئەم سێ فەرزە دادەنێین دەڵێین: خۆ -مەحاڵە هەرچی شت هەیە، واتە: ئەوەی (موجودات)ە بوونەکەی واج بێت، یەعنی واجب الوجود بێت، چونکە- (موجودات) چەندەها جۆری بێژمارەی هەیە- ئەمانەیش هی وایان تیایە کە لە بزوتنەوەدایەو پێویستی بە بزوێنەرێک هەیە، هی وایان تیایە پێکهاتووەو پێویستیبە پێک هێنەرێک هەیە، وە ئەم پێک هێنراویشە لەچەند بەشێک پێک هاتووە کە ئەو بەشانە لەپێش پێک هاتووەکەدا هەبوون..

وە مەحاڵیشە هەرچی شت هەیە، واتە: هەموو (موجودات) بوونەکەی مومکین (ممکن) بێت، چونکە مومکین پێویستی بە هۆیەک هەیە، لە جیهانی ئیمکانەوە بیهێنێتە جیهانی واقیع و (بالفعل)..

فەرزی سێهەم دەمێنێتەوە، ئەویش ئەوەیە هەندێک لە (موجودات) بوونەکەی (ممکن)بێت، وە هەندێکی تریش بوونەکەی واجب و پێویست بێت، ئەوەی کە بوونەکەی (ممکن)ە وەک ئەم جیهانە، ئەوەش کە بوونەکەی پێویست و واجبە وەک بوونی خوا.. کە هەر خوایش هۆی یەکەمە بۆ بوونی ئەم جیهانەو، مەحاڵیشە شتێ پێش خوا کەوتبێت، چونکە ئەوەی پێشی کەوتبێ ئەوە شیاوی ئەوەیە بوونەکەی واجب بێت..

## بەڵگەی ڕێک سازی ( التسوية )

ئەگەر دروستکراوەکان بەڵگەبن لەسەر بوونی خوا، ڕێکـ سازی (التسوية) زیاتر بەڵگەیە، چونکە هەرشتێ ڕێکـ و پێکـی تیابوو نیشانەی ئەوەیە بایەخی زۆرتری پێدراوە. چونکە لەوانەیە شت دروست بکرێت بەڵام ڕێکـ و پێکـ نەبێت و ڕێکـ سازی تیا نەکرێت..

واتای (تسوية) لەهەر شتێکا بریتییە لەوە کە: دروست کردنەکەی بەجوانیو بەتەواوی بێت، بەجۆرێکیوا ئامادەبێت بۆ ئەنجامدانی کاری خۆی، وە بگات بەو کەماڵەی بۆی دیاریکراوە، وە ئەوەی دەبێتە هۆی لەباریو مانەوەی پێی بدرێت، وە ڕێکـ و چاکـ بکرێت، ئەندامەکانی لەشی لەگەڵ یەکتردا بگونجێن، بەجۆرێکی وا جیاوازی و تەفاوت لە نێوانیاندا نەبێت کە زیان بەو مەبەستە بگات کە بۆی دروست کراوە..

قورئان بە دەستەواژەی جۆراوجۆر ئەو مەبەستەمان بۆ باس دەکات، کە مەعنایان زۆر لێکـ نزیکە، وەکـ: (إحسان) لەم ئایەتەدا (..الذي أحسن كل شيء خلقه)[٣٥] یەعنی: ئەو خوایەی هەرشتێکی دروست کردبێ بەقەشەنگی دروستی کردووە.. یا وشەی (إتقان) لەم ئایەتەدا: (صنع الله الذي أتقن كل شيء)[٣٦] واتە: دروستکراوی ئەو خوایەی کە بەدیقەت و وردەکاری هەموو شتێکـ ئەنجام دەدات. یا (إعطاء كل شيء خلقه) هەروەکـ خوا لەسەر زمانی (مووسا)وە بۆمان باس دەکات لەم ئایەتەدا: (ربنا الذي أعطى كل شيء خلقه ثم هدى)[٣٧] واتە: پەروەردگاری ئێمە ئەوەیە کە هەرشتێکی دروست کردبێ، چی پێویستی بنەڕەتی بێت بۆ ژیانی پێی بەخشیوەو ئینجا ڕێنموونیشیکردووە.. واتای (إعطائه خلقه) ئەوەیە: هەر دروستکراوێکـ چی بگونجێ لەگەڵ خۆیدا ئەوەی پێ بەخشیوەو بەوجۆرەش وێنەی کێشاوە..

جاری وایش دەبێت باس کردنی (تەسویە) دەکات بەنەبوونی جیاوازی لەنێوان دروستکراوەکانی خوادا، وەکـ لەم ئایەتەدا کە دەفەرموێت: (ماترى في خلق الرحمن من تفاوت )[٣٨] واتە: لە دروستکراوەکانی خوادا جیاوازیو تەفاوت نابینیت..

---

[٣٥] سوورەتی السجدة ئایەتی ٧ .

[٣٦] سوورەتی النمل ئایەتی ٨٨.

[٣٧] سوورەتی طه ئایەتی ٥٠.

[٣٨] سوورەتی الملک ئایەتی ٣.

ئەم ڕێک سازی و تەواوکارییە لە دروستکراوەکاندا -بەشێوەیەکی گشتی- ڕوالەتێکە و لەهەموو دروستکراوەکاندا دەبینرێت، بەتایبەت لە زیندەوەران دا، بە تایبەتی‌تر لە نادەمیزاددا..

بۆ نموونە :

**(ا) زەوی:**

خوا زەوی دروستکردووە و لەئەنجامدانیا تەواوکاری و ڕێکسازی بەکارهێناوە، بە جۆرێکی وا بۆ قەرارگاو لانکەی جۆری نادەمیزاد بگونجێ، لەبەرئەوە وەک ڕایەخ ڕای خستووە و درێژەداری کردووە، گەردن کەچ و فەرمانبەرو ڕامی کردووە، شاخ و کێف گەلێکی وەک میخ پیا داکوتاوە، تا لەرزەش نەکات بەرەکەتی تێخستووە و خواردنی تیا دیاری کردووە، خۆ ئەگەر توێکڵی زەوی هەمووی ڕەق و بەردین بوایە، یا سەرزەوی هەمووی وشکانی بووایە، یا هەمووی ئاوو ئۆقیانووس بوایە، بۆ کشتوکاڵ و بەدەستهێنانی بەروبووم نەدەگونجا..

ئەگەر توێکڵی زەوی بەئەندازەی چەند پێیەک لەمەی ئێستا قەبارەدارتر بووایە، هەرچی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و ئۆکسجین هەیە هەمووی هەڵدەمژی .. ئەوکاتە ژیانی ڕووەک نامومکین و نەگونجاو دەبوو..

(ب) هەرچی **گیاندارێک** لەسەر زەویدا هەیە، بە جۆرێکی وا خولقێنراوە و ڕێک سازی و تەواوکاری تیاکراوە، کە بتوانێ بە سووک و ئاسان، کاری خۆی ئەنجام بدات..

بۆنموونە: وشتر ، خوا شێوە و هەیئەتی وشتری وا دروست کردووە کە لەگەڵ باری ژیان و گەشتی دووروودرێژی بیابانی خۆیدا بگونجێت، لەبەر ئەوە خوا گەردنێکی بەرزی درێژی پێ بەخشیوە تا سەری بولند بکاتەوە و بەچاوەکانی لە تەپ و تۆزی لمی بیابان لای بدات و بیپارێزێت، وە هەروەها لچێکی قەوی قڵیشاوی پێبەخشیوە تا بتوانێت دڕکی بیابانی پێ بخوات و ئازاری پێنەگات.. دووگێکی پێبەخشیوە بۆ کۆکردنەوەی چەوری، تائەگەر لە بیابانی وشک و نەداردا خواردنی لێبڕا سوودی لێوەرگرێت.. وە قاچی بە سمێک کۆتایی نەهاتووە بچەقێتە ناو خۆڵ و لمی بیابانەوە، سمەکەی وەک سمیئەسپ وهێسترو کەر نییە.. بەڵکو خوا سمێکی نەرمی دووفاقی پانی پێبەخشیوە تا بەئاسانی بتوانێ بەسەر لمی بیاباندا تێپەڕێت و نەچەقێ.. هەر لەبەر ئەمەیشە ناویان ناوە (کەشتی بیابان). وە هەروەها شوێنەواری ئەم کارسازی و تەواوکارییە لەهەموو زیندەوەرێکدا دەبینین..

هەموو زیندەوەرێک خوا کەرەسەیەکی وای پێ بەخشیوە بتوانێت خۆراکی گونجاوی خۆی پێ بەدەست بێنێت.. وە دەستگایەکی وای پێ بەخشیوە ئەو جۆرە خواردەمەنییەی خۆیشی پێ هەس بکات..

بۆ نموونە: ئەو گیاندارانەی دڕندەن دەنووک و نینۆک و کەڵبەیەکی وایان پێدراوە بتوانن زیندەوەرانێکی تری پێ بکوژن، وە دەزگایەکی هەرسی وایان پێ بەخشراوە کە بتوانن گۆشتی کرچ و کاڵی پێ هەرس بکەن..

ئەو ئاژەڵانەی کە گیاخۆرن، ورگێکی گەورەی وایان پێ بەخشراوە، کە وەک عەمارێک بێت بۆ ئەو خواردنەی کە خێرا دەیخۆن و هەڵی دەلووشن، تا لەکاتی پشوودان و ئیسراحەت کردندا هەڵی بێننەوەو جارێکیتر کاوێژی بکەنەوە..

پەلەوەرەکان دەنووکێکی وایان پێ دراوە کەبتوانن خواردەمەنی خۆیانی پێهەڵگرن. بە گوێرەی پێویستی خۆیان دەنووکی درێژ یا کورت یا لارو چەماوەیان پێ بەخشراوە، تا بگونجێ لەگەڵ جۆری ئەو خواردەمەنییەی پێویستیانە..

وە هەروەها هەموو جۆرە گیاندارەکان جۆرە چەکێکیان پێ دراوە بۆ پارێزگاری کردنی مانەوەی خۆیان. تا لە هەراو زۆرانبازی نێوان خۆیو غەیری خۆیدا بۆ مانەوەو پایەداری بتوانێت پارێزگاری لە خۆی بکات ..

کەڵبە چەکە، نینۆک چەکە، شاخ چەکە، ژەهر چەکە، دندووکی تیژو چەماوە چەکە، پەڕی تیژ چەکە، توانای خۆ ون (گوم) کردن چەکە، تیژڕەوی چەکە، توانای پەروازکردن چەکە، ئەو گیاندارانەئەگەر ئەو چەکانەیان نەبوایە کە پێیان دراوە، بەهێزیان لاوازی لەناودەبردو، گەورەکانیان بچووکەکانیان قڕ تێدەخست..

### (ج) *لە ئادەمیزاددا* :

کاتێک ئێمە واز لە باسی سروشت و گیانداران دێنین و بەرەو باسی ئادەمیزاد سەردەکەوین، رواڵەت و نیشانەکانی کارسازیو تەواوکاری بە روونتر تیا دەبینین، چونکە ئادەمیزاد لە جوانترین شێوەدا دروستکراوە..

ئادەمیزاد بۆ کارێکی گەورەو گرنگ دروستکراوە، کە ئەویش بریتییە لە: سەرکاریو سەرپەرشتی کردنی زەویو جێنشینی و خەلافەتی خوایی لەسەر زەویدا. هەر لەبەر ئەوەیشەکە سیفاتی تایبەت و هەڵبژاردەی پێبەخشراوە، لەگەڵ دەزگا گەلێکی ماددیو مەعنەویدا، تا یارمەتیدەری بن بۆ ئەنجامدانی کارەکەی، وە رێگەی کاری گرنگی بۆ ئاسان بکات..

ئەگەر سەرنجێکی دروست بوونی لەشی ئادەمیزاد بدەین، شتیسەیرو سەرسوڕهێنەر دەبینین، چ کارسازیو تەواوکارییەکی گەورەیتیا ئەنجام دراوە!! چەند بە وردەکاری بەرنامەی بۆ دارێژراوە!! چۆن کاری دەزگا جۆراوجۆرەکانی لەشی یەکخراوە!! بەجۆرێکی وا گرنگترین دەزگای دروستکراوی دەستی خۆی لەچاو ئەو دەزگایانەدا هیچ و بێ نرخە!! ژیری لەو دەزگایانەدا سەراسیمە دەبێت، زمان و قەڵەم ناچار دەبن مەدح و سەنای بکەن!!

دەزگای ماسولکەیی ، دەزگای ئێسکی، دەزگایهەرسی، دەزگای خوێنی، دەزگای هەناسەدانی، دەزگای زاووزێی، دەزگای لیمفاوی، دەزگای دەماری،

دەزگای میزی، دەزگای چێژتن و بۆن کردن و بیستن وبینینی، هەریەک لەمانە نایەت و نیشانەیەکن ژێری ناچار دەبێت سەری کڕنووشی بۆ نەوی بکات و دڵەکانیش لەبەرامبەریەوە گەردن کەچ ببن..

گۆڤاری (العلوم)ی ئینگلیزی دەڵێت: (ئەگەر سەرنجی دەستی ئادەمیزاد بدەین دەبینین لە پێشەنگی شتە سەیرو نایابەکانی سروشتەوەیە، لەراستیدا زۆر زەحمەتە -بەڵکو مەحاڵ و نەگونجاویشە- ئامێرێک دروست بکرێ لە سادەیی‌و توانایی‌و خۆگونجاندن و خێرایی‌دا لەدەستی ئادەمیزاد بچێت!

کاتێک دەتەوێت کتێبێک بخوێنیتەوە، بەدەستت دەیگریت، هەر بە دەست لە شوێنێکدا دای‌دەنێیت بۆ خوێندنەوە بشێت، نزیک کردنەوەی، دوورخستنەوەی، دەست ئەنجامی دەدات، کاتێ دەتەوێت لاپەڕەیەک هەڵبدەیتەوە، پەنجە دەخەیتە ژێر لاپەڕەکەوەو بەئەندازەیەک فشاری بۆ دێنیت کە پێی هەڵبدرێتەوە، بە هەڵگەڕانەوەی کاغەزەکە فشارەکە نامێنێت. هەر دەستە کە قەڵەم دەگرێت و پێیشی دەنووسێت، ئادەمیزاد هەر ئامێرێکی پێویست بێت، دەتوانێ بەدەست بەکاری بهێنێت، وەک کەوچک، چەقۆ، چاپی دەستی، پەنجەرەکردنەوەو داخستنی، ئینسان هەرچی بوێت بەدەست هەڵی دەگرێت، ئەم دوو دەستەیش هەریەکەیان نۆزدە کۆمەڵە ماسولکەو بیست و حەوت ئێسکیان تێدایە)[39]

بەشێک لە گوێی ئینسان (گوێچکەی ناوەڕاست و ناوەندی) بریتییە لە نزیکەی چوار هەزار کەوانی وردی ئاڵۆزو پێچیدە، لە رواڵەت و قەوارەدا بە یاسایەکی قەشەنگ یەکخراون، دەگونجێت بگوترێت: ئەو کەوانانە لە ئامێرێکی مۆسیقا دەچن، بەجۆرێکی‌وا ئامادەکراون تا دەنگ وەربگرن و بینێرن بۆ دەماغ، دەنگ بێت یان کیڕەکیڕ، یا گرمەو ناڵە، یا خشەی دارو درەخت.. یا ئاوازی تێکەڵی مۆسیقای دەستەی (ئۆرکسترا) بوەستێت، کە ئەم مۆسیقایانە هەریەکەیان ئاوازێکی تایبەتی هەیەو بەجۆرێکی قەشەنگ و گونجاو یەکخراون[40]..

چەقی بینین لە چاودا (بیلبیلە) سەدو سی ملیۆن رووناکی وەرگری تێدایە، ئەمەش لەم بەرەوبەری دەمارەکانەوەیە، برژانگ و پێڵوو شەوو رۆژ کاریان پاراستنی چاوە، لەگەڵ ئەوەش دا بزووتنەوەکەیان دادەنرێت بە بزووتنەوەیەکی ویستەکی (ارادي) .. پێڵوو برژانگ لە تۆزو گەردیلەی وردو لەشە نامۆکان چاو دەپارێزن، وە هەروەها بەهۆی سێبەری برژانگەوە چاو لە تیشکی راستەوخۆی رۆژ

---

[39] الله والعلم الحديث .

[40] العلم يدعو للإيمان .

دەپارێزن و تیشکەکەی بۆ دەشکێننەوە.. پێڵوو ئەرکێکی تریشی لەئەستۆدایە کە نایەڵێت چاو تووشی وشکی ببێ، شلەی فرمێسک گەورەترین پاکژکەرە بۆ چاو[41]..

(دەزگای چێژتن لە ئادەمیزادا (زمان)ە. کۆمەڵێک خانەی چێژتن کەبەسەر مەمیلەی پەردەی لیکیەوەن ئەوکارە ئەنجام دەدەن.. ئەو مەمیلانەش وێنەی جۆراوجۆریان هەیە: دەزوولەیی، قارچکی، نیسکی، بەهۆی کۆمەڵە دەماری چێژتن و زمان و گەرووەوە ئەو مەمیلانە خواردنیان پێدەگات.. دەمارەکانی چێژتن لەکاتی خواردندا هەست بە تامی خواردنەکە دەکەن و لە زووترین کاتدا شوێنەوارەکەی دەگاتە دەماغ،.. ئەم دەزگای چێژتنە لەسەرەتای دەمەوە هەیە، تا ئەگەر ئادەمیزاد هەستیبە شتێکی زیان بەخش کرد خێرا تفی بکاتەوە!! هەر بە هۆی ئەو دەزگایەوە ئینسان هەست بە تاڵیو شیرینیو ساردیو گەرمیو ترشیو سوێریو ئازاری زمان و لەم بابەتانە دەکات.. وە هەروەها زمان نۆ هەزار نووکەی وردی چێژتنی تێدایەو هەموو نووکەیەکیش بەهۆی چەند دەمارێکەوە پەیوەندە بە دەماغەوە.. جا دەبێ ژمارەی ئەودەمارانە چەند بێ؟ یا قەوارەیان چۆن بێ؟ یا چۆن بەتەنیایی کاردەکەن؟ یا چۆن هەست کۆدەکەنەوەو دەینێرن بۆ دەماغ؟)[42] بیر لەوە بکەرەوە..

دەزگای دەمار -کە توانای تەواوی بەسەر تەواوی لەشدا هەیە- لە کۆمەڵە دەمارو ریشاڵە دەمارێک پێک هاتووە کە بە هەموو لەشدا بڵاوبوونەتەوە، ئەمانەش پەیوەندن بەوانەی لە خۆیان گەورەترن، گەورەکانیش پەیوەندن بە دەزگای دەماری ناوەندییەوە.. ئەگەر هەرکاتێک بەشێک لەبەشەکانی لەش ئارەحەتی پێبگات یا بەهۆی گۆڕانێکی سادەی پلەی گەرمایشەوە بێت. ئەو ریشاڵە مووانە ئەو هەستە دەگەیەنن بەو دەمارانەی ترو ئەوانیش هەواڵ دەنێرن بۆ دەماغ، تا چ کارێ پێویست بێت ئەنجامیبدات.. تیژی وخێرایی ئەو ئاگادارکردنەوەیەو هێما بۆ ناردنە لەچرکە (ثانیة)یەکدا سەد مەترەیە.. )[43]

خۆ ئەگەر ئێمە سەرنجێکی دەزگای هەرس بدەین لەم بارەوە (کە) کارێکە لە کارگەیەکی کیمیاییدا، وە سەرنجی ئەو خواردنەی دەیخۆین وابدەین کە ماددەی کاری کارگەکەیە، زۆر خێرا هەست بەوە دەکەین: کە چ کردارێکی سەیرو عەجیبە!! چونکە نزیکە بڵێین: گەدە هەموو شتێ هەرس دەکات تەنیا خۆی نەبێت).[44]

---

[41] اللـه والعلم الحديث .

[42] اللـه والعلم الحديث .

[43] اللـه والعلم الحديث .

[44] اللـه والعلم الحديث .

( ئێمە لەسەرەتاوە چەند جۆرێکی خواردەمەنی وەک ماددەی کار دەکەینە ناو ئەم کارگەیەوە، بێئەوەی گوێ بە خودی کارگەکە بدەین، یا بیر لە چارەسەری کیمیایی (بۆ) چۆنیەتی هەرسەکە بکەینەوە.. ئێمە گۆشتی چەق وکەلەرم و گەنم و ماسی سوورۆکراو دەخۆین و بە ئەندازەیەک ئاوەوە دەیکەینە خواریێ)[45] .

( لەنێوان ئەم هەموو تێکەڵ و ئاوێتەیەدا گەدە (معدە) شتانێک هەڵدەبژێرێ کە سوودبەخش و بەکەڵک بن.. هەر جۆرە خواردنێک دەکرێتە گەدەوە لەت و پەتی دەکات و دەیگێڕێتەوە بۆ ئەو ماددە کیمیاییانەی لێی پێک هاتووە، ئنجا بێکەڵکەکانی لادەدات و دەیکاتە پاشەڕۆ، ئەویتریشی دەگۆڕێت بە پرۆتین گەلێکی نوێو دەیکاتە خۆراک بۆ خانە (سلول)ە جۆراوجۆرەکانی لەش.. وە ئامێری هەرس کلس و گۆگردو یۆدو ئاسن و هەموو ماددە پێویستیەکانیتر هەڵدەبژێرێ، وە بایەخ بەو پارچەو بەشانە دەدات کە سەرەکیو بنەڕەتین بۆ لەش تا لەناونەچن، تا هەرمۆناتەکان بەجۆرێکیوا بەرهەم بێنێ کە هەموو پێویستیە سەرەکیەکانی ژیان لەئەندازەیەکی رێکخراودا ئامادەبێت، وە هەروەها بۆ نیشاندانی ئامادەبوون بۆ هەر حاڵەتێک رووبدات، چەوری هەڵدەگرێو وەک ماددەیەکی (إحتياط) کۆی دەکاتەوە، بۆ بەرەو رووبوون لەگەڵ برسیەتیدا، دەزگای هەرس ئەم کارە دەکات هەرچەند پێچەوانەی مەیل و بیرو ئارەزووی ئادەمیزادیش بێت.. ئێمە لەم کارگە کیمیاییەدا ئەم هەموو جۆرانە تێکەڵ و ئاوێتە دەکەین، بێئەوەی گوێ بەو شتانەیش بدەین کەدەیخۆین، چونکە متمانەی تەواومان بەوە هەیە، کە: گەدە بەجۆرێکی خۆکار ئەو کارەئەنجام دەدات بۆ مانەوەی ژیانمان، کاتێک ئە و خواردنانە شیتەڵ دەکات و سەرلەنوێ ئامادەی دەکاتەوەو پێشکەش بە خانەکانی لەشی دەکات، ئەو خانانەی کە ژمارەیان لە ملیاردەها تێپەڕ دەکات و لە ژمارەی هەموو ئادەمیزادەکانی رووی زەوی زۆرترو زیاترە، لەناو ئەم هەموو ژمارە زۆرانەدا هەر خانەیەک دەبێت خواردنی تایبەت و سەربەخۆی بۆ بڕوات، ئەو خانە دیاریکراوە چی پێویست بێت دەبێت هەر ئەوەی بۆ بچێت و نابێت شتێکی تری بۆ بڕوات.. ئەو خانەیەش ماددەکەی خۆی دەگۆڕێ بۆ ئێسک، یا نینۆک، یا گۆشت، یا موو، یا چاو..، یا ددان، یا خوێن)[46] بەگوێرەی خۆیو ئەوەی پێویستیەتی..

( کەوابوو لێرەدا کارگەیەکی کیمیاوی وا هەیە، ئەوەندە بەرهەمی زۆرە، کە هیچ کارگەیەکی گەورەی دروستکراوی دەست ومێشکی ئینسان ناتوانێت ئەوەندە بەرهەمی ببێت.. وە لێرەدا یاسایەک هەیە بۆ کەرەسەهێنان (التوريد) گەورەتر لەهەر یاسایەکی گواستنەوەو دابەشکردن و بڵاوکردنەوە کە دنیا بەخۆیەوە

---

[45] الله والعلم الحديث .

[46] الله والعلم الحديث .

دیبێتی.. وە لەوپەڕی نەزم و ڕێکیدا هەموو شتێکی تیا تەواو دەبێت) بۆ نموونە: (لەکاتی ساواییەوە تا پەنجا ساڵی ئەم کارگەیە هەڵەو ئیشتیباهێکی وا ناکات کە گرنگ بێت، لەگەڵ ئەوەدا زیاد لە ملیۆن جۆر لەو پارچانە لەت وپەت دەکات و وەریان دەگرێت و دەیان نێرێت، لەگەڵ ئەو[47]ەش دا زۆریان سام و کوشندەن)[48].

مامۆستا (ا.ک. مۆریسۆن) دەڵێت: (بێگومان شەرح کردن و باسی ئەو کارە سەرسام هێنەرەی کە کارگەی گەدە پێی هەڵدەستێت و ئەنجامی دەدات، لەکاتێکدا ژیان نەبێت وێنەی ئەم کۆمەڵە موعجیزانە دەست ناکەوێت و مومکینیش نی‌یە بەهیچ جۆرێک ڕووبدات.. ئەو موعجیزانەی گەدە ئەنجامیان دەدات، بەپێی نەزم ویاسایەکی تایبەت و تەواو ڕوودەدەن، نەزم و یاساش هەمیشە دژ بە ڕێکەوت و (تصادف)ە.. ئایا ئەو نەزم و یاسایە دروستکراوی (خالق) نی‌یە؟!)[49]

شتێک کە زۆر گرنگتر بێت لەوانەی تائێستا باسکراون لەبارەی کارسازی و تەواوکاری لە ئادەمیزادا، وە تا ئێستا باسمان نەکردبێت (عەقڵ)ە..

## (د) عەقڵ :

بێگومان ئادەمیزاد نە هێزێکی ماسولکەیی وەک هێزی (گا)ی پێبەخشراوە، وە نە تیژڕەوییەک وەک تیژڕەویی ئەسپ، وە نە خۆگرتنێک لەسەر ناڕەحەتی وەک خۆگرتنی وشتر، وە نە باڵێک وەک باڵی پەلەوەر، وە نە چنگ و کەڵبەیەک وەک چنگ و کەڵبەی شێر، وە نە چاوێکی (میکرۆسکۆبی) وەک چاوی وردە جانەوەران، وە نە چاوێکی (تەلسکۆبی) وەک چاوی هەڵۆ، وە نە سروشتێکی ڕێنموونیکەر وەک سروشتی هەنگ و مێروولەو کۆتری نامەبەر.. هیچ کام لەمانەی پێنەدراوە، بەڵام لەواقیع دا ئینسان شتێکی بەسوودو زۆر گەورەو گرنگتر لەمانەی پێ بەخشراوە، زیندەوەران بە ئاژەڵ و پەلەوەریانەوە، خەڵاتێکیان پێ نەدراوە وەک خەڵاتی ئادەمیزاد گەورەو گرنگ بێت. ئەو خەڵاتەش عەقڵ و ژیری‌یە.. عەقڵی دراوەتێ کە بیری پێ بکاتەوە، ڕۆحی پێدراوە کە حەقیقەتی بۆ ڕووناک بکاتەوە..

بەهۆی ئەو عەقڵەوە توانیویەتی گاو ئەسپ و وشتر بکاتە هۆگری خۆی.. وە توانیویەتی ئاژەڵی گەورەو لەش زل و بەهێز، ڕام بکات و بۆ پێویستی و ژیانی خۆی بەکاریان بێنێ.. توانیویەتی چەرخیان بۆ دروست بکات و شتیان پێ

---

[47] الله والعلم الحديث .

[48] الله والعلم الحديث .

[49] العلم يدعوا للايمان .

رابکێشێ، هێزو تواناو تیژڕەوییان چەند بەرابەر بکات، بەوجۆرە ئینسان توانی ساق و لاقیان درێژترو پشتیشیان بەهێزو بەتواناتر بکات..

ئادەمیزاد بەهۆی ئەو دەزگا میکانیکیانەوە کە دروستی کردووە، توانیویەتی لە ماوەیەکی کەمدا رێگایەکی دووروودرێژ ببڕێ، وە قاڕڕەو کەرتەکانی جیهان بدا بەیەکداو جیهان بکاتە (ئاواییەکی گەورە) .. وە هەموو کارێکی دەستی خۆی بکاتە بەرێوەبەریەتی ئەو دەزگایانەو زاڵ بوون بەسەریان دا..

توانیویەتی وەک نەهەنگ لەدەریاکان دا رۆبچێ، وەک باڵندە بەئاسمانا پەرواز بکا، بگرە لە نەهەنگ و باڵندەش سەرکەوتووتر بووە.. ئینسان توانیویەتی لە یاساکانی سروشت دا دەسەڵات پەیدا بکات، بەرد بتەقێنێو رووبار لێبدات و هەڵم و گازو کارەبا بەکاربێنێ -لەم دواییەش دا- ئەتۆمی تەقاندەوە، هێرشی بردە سەر بۆشایی فراوانی ئاسمان، هەوڵی سەرکەوتنی داوە بۆ ئەستێرەکان..

بەڵێ ئادەمیزاد چاوی (میکرۆسکۆب)ی شت گەورەکەری وەک چاوی جانەوەرە وردیلەکان پێنەدراوە، و ە چاوی (تەلسکۆبی) شت نزیک کەرەوەی وەک چاوی هەڵۆی پێنەدراوە، بەڵام بەهۆی عەقڵیەوە توانیویەتی میکرۆسکۆبی کارەبایی وا دروست بکات کە بەکتریای نەبینراوی پێ ببینێت. وە گیانداری فرە وردی پێ ببینێ کە دەیگەست ونەیدەبینیو نەیدەزانی چیە..

بەهۆی تەلیسکۆبەکەیەوە توانی کاکێشان (سدیم) ببینێ، ئەم دەزگایەش وردەکارییەکی وای تیا کراوە، کە دوو ملیۆن جار توانای بینینی گەورە کراوە، ئینجا توانیویەتی ئەو سەدیمە ببینێ!!

ئادەمیزاد هەستی بیستنی بۆزیاد لە پێویستی خۆی پێنەدراوە، هەروەک دراوە بەو گیاندارانەی کە لە دەرەوەی جغزی لەرینەوەی تایبەت بەئێمە دەنگ دەبیستن.. بەڵام بەهۆی کەرەسەکانیەوە توانیویەتی لەدووری چەند میلێکەوە گیزەی مێشێک ببیستێ، وەک ئەوە کە لەپەنای گوێیا بێت.. بەو کەرەسانەو وێنەی ئەوانە دەتوانێ کەوتنی تیشکی خۆر تۆمار بکات..

ئایا ئەم هەموو کارە سەیرو عەجایبانەی عەقڵی ئینسان ئەنجامیان دەدات، هەموو بەرێکەوتیکەرێ کوێر رووی دابێت؟! ئایا ئەنجامی کارلێکی ئەو ماددانە بن کە لەش و تەنیان لێ پێک هاتووە؟!! یا دەستکردی خوایەکی داناو کاربەجێن؟!

## بەڵگەی ئەندازەگیری ( دليل التقدير )

(تەقدیر) ئەوەیە هەرشتێ بەئەندازەو میزان و رێک وپێکیو حیسابکاری دروست بکرێ، بەجۆرێ لەگەڵ کات و جێگەیا بگونجێ، وە لەگەڵ هەبووەکان

(الموجودات)ی تریش دا بسازێ، چ دووربن لیی یا نزیک.. کاری نەبێتە کۆسپ لە ڕێگەی کاری ئەوانی تردا، وە هاوکێشیو هاوسەنگیەکی تەواو لەگەڵ دروستکراوەکانی تردا، بەدی بێنێو بێتە هۆی یەکخستنی بزووتنەوەی هەموو بوونەوەر..

ئەگەر ڕێک سازی (التسویة) بریتی بێ لەوە هەموو شتێ لەدروست کردن و بەدی هێنانیان جوانیو تەواوییەکی وای پێ درابێ کە بتوانێ کاری خۆی بەجۆرێکی گونجاوو شیاو ئەنجام بدات.. بێگومان (تەقدیر)یش ئەوەیە: بەئەندازەیەکی وابێ سوود بەخۆی بگەیەنێو زیانی بۆ غەیری خۆی نەبێ. لەگەڵ دروستکراوەکانی تردا لێک نەدات.. ئەوەش کاتێ بەدی دێت و تەواودەبێت کە لەجێگەو کاتی گونجاو و شیاوی خۆیا دابنرێ.. وە بەئەندازەیەکی وابێت کار چاک کات نەک خراپ، وە بەجۆرێکی وابێت هاوسەنگیو یەکخستن لەنێوان یەک بەیەکی بوونەوەرو پارچەکانیا بەدی بێنێ..

ئەم ئەندازەگیرییە لەهەموو شتێکا هەیەو ڕواڵەتێکی گشتییە هەروەک قورئان لەو بارەوە ئاگادارمان دەکاتەوەو دەفەرموێ: (هەموو شتێک لای خوا بەئەندازەیە - و کل شيء عنده بمقدار-)[50] وە (هەموو شتێکی دروست کردووە ئینجا بەئەندازەش دیاری کردووە -وخلق کل شيء فقدره تقدیرا-)[51] وە (خوابۆ هەموو شتێک ئەندازەی داناوە -قد جعل الله لکل شيء قدرا-)[52] وە (ئێمە هەموو شتێکمان بەئەندازە دروست کردووە- إنا کل شيء خلقناه بقدر-)[53] وە (خەزێنەی هەموو شت لای ئێمەیەو بەئەندازەی دیاریکراویش دەینێرینە خوار - وإن من شيء إلا عندنا خزائنه وما ننزله إلا بقدر معلوم-)[54]

بۆ نموونە :



خوا جوانکاری تیا بەدی هێناوە، بەو مەعنایە ئامادەی کردووە بۆ ئەنجام دانی فەرمانی خۆی لە ئاوداشتن و ئاودێریو خواردنەوەو پاک کردنەوەو ئەو جۆرە شتانە...

بەڵام ئەو ئاوەی کە خوا دروستی کردووەو لە زەویدا جێگیری کردووە، بەئەندازە دروستی کردووەو بەئەندازەش دەیبارێنێ، بەجۆرێکی وا لە پێویستی

---

[50] سوورەتی الرعد ئایەتی ٨ .

[51] سوورەتی الفرقان ئایەتی ٢.

[52] سوورەتی الطلاق ئایەتی ٣.

[53] سوورەتی القمر ئایەتی ٤٩.

[54] سوورەتی الحجر ئایەتی ٢١.

خەڵکی کەمتر نەبێت تا نەبێتە هۆی گرانیو نەبوونیو قات وقڕی، وە زیاد لە پێویستیشیان نەبێت تا نەبێە هۆی نقوم بوون و زیان، وە تۆقیانووسەکان بەسەر وشکانی دا زاڵ نەبن، وە سوێری بەسەر شیرینیدا زاڵ نەبێت، هەموو ئەمانە لە واتای ئەم ئایەتەوە وەردەگیرێت کە دەفەرموێت: (وأنزلنا من السماء ماء بقدر..)[55]

واتە: ئێمە بەئەندازە ئاومان لە ئاسمانەوە باراندووە ..

## روْژ

خوا جوانکاری تیا کردووە ، تا ئەویش بتوانێت بەجوانی کاری خۆی ئەنجام بدات ، وەک کۆمەکیکردنی ژیان بە وزەو تیشک و گەرمایی، بەڵام وای دروست کردووە کە لە تەوەرەکەی خۆیا بسورێتەوە تا دەگاتە ئەو شوێنەی بۆی دیاریکراوە، وە لەگەڵ ئەستێرەیەکی تردا لێک نەدەن، وە ئەوەندە لە زەوی نزیک نەبێتەوە کە گیاندارو بێگیانی بسووتێنێ ، ئەوەندەش لێی دوورنەکەوێتەوە لەو ئەندازە گەرماییە بێبەشمان کات کە بۆ ژیان پێویستە، قورئان لەم ئایەتەدا هێمای بۆ ئەوانە کردووە : (والشمس تجري لمستقر لها ذلك تقدير العزيز العليم، والقمر قدرناه منازل حتى عاد كالعرجون القديم، لاالشمس ينبغي لها أن تدرك القمر ولا الليل سابق النهار وكل في فلك يسبحون)[56].

واتە: رۆژ بەرەو ئارامگای خۆی دەڕوات، ئەوەش خوای بەدەسەڵات و زانا بۆی دیاریکردووە، مانگیش چەند مەنزڵێکمان بۆ دیاریکردووە -دەڕوات گەورە دەبێ ئینجا- دەگەڕێتەوە تا وەک دەسکە هێشووی کۆنی خورمای لێدێت و بچووک و باریک دەنوێنێ، نە خۆر بۆی هەیە بگات بە مانگ و نە شەو بۆی هەیە پێش رۆژ بکەوێ- مانگ و خۆر و ئەستێرەکان- وە هەموویشیان لە خولگەی خۆیان دا دەسووڕێنەوەو مەلە دەکەن .

هەموو ئادەمیزادێک لەهەموو سەردەمێک دا، بەپێیتوانی خۆی، دەتوانێ بەهۆی وردبوونەوەو دەرکی سروشتی خۆی ئەوە ببینێ، کە : هەموو شتێک لەم بوونەوەرەدا ، بەپێی ژمارەو ئەندازەیەکی دیاریکراو، دروست کراوە.

زانیاری نوێیش بەکەرەسەو دەزگای دۆزینەوەی خۆیەوە هات و پەرچە (نقاب)ی لەسەر رووی نهێنییەکانی بوونەوەر لاداو کاربەجێیی تەواوی خوا دەرکەوت. وەنهێنییە سەرسوڕهێنەرەکانی دەرکەوتن کە لە نێوان دروستکراوەکانی خوادا چیها ئەندازەو سنوورو یاساو ترازوو هەیە!!

لەو فەزا فراوانەدا کە نازانرێ سنووری تا کوێیە، ملیۆنەها ملیۆن ئەستێرەو هەسارەی تیا دەسوڕێتەوە، هەندێ لەو هەسارانە بەچەندەها جار بەڵکو

---

[55] سوورەتی المؤمنون ئایەتی ١٨.

[56] سوورەتی یس ئایەتی ٣٨-٤٠.

بە ملیۆنەهاجار لە خۆری خۆمان گەورەترە، وەک هەسارەی گەلاویژ کە بیست جار لەم خۆرەی خۆمان گەورەترە.. وە پەنجا ئەوەندەی خۆری خۆمان رووناکیو شەوقی زۆرترە ..

ئاسمان ناسان دەڵێن: ئەو ئەستێرەو هەسارانەی کەژمارەیان لە چەند ملیارێک زیاترە، هی وای تیایە بەچاوی بێوەسیلە دەبینرێت، وە هی وایشی تیایە بەدەزگای شت گەورەکردن نەبێت نابینرێت، وە هی وایشیان هەیە دەزگا هەست بە بوونیان دەکات، بەڵام ناتوانێت بیبینێت. ئەمانە هەموویان لەتەوەرەی نادیاری خۆیانا دەخولێنەوە، بێئەوەی مەودای موگناتیسی ئەستێرەیەک و ئەستێرەیەکی تر، ئەوەندە لێک نزیک ببێتەوە لەیەکتر بدەن .

چەنە ئیحتیمالی هەیە ئەودوو کەشتیە لەیەک بدەن: کە یەکێکیان لە دەریای سپی ناوەڕاستدا[٥٧] دەڕوات و ئەوی تریشیان لە ئۆقیانووسی ئارام دا[٥٨] -با هەردووکیان بەرەو شوێنێک و بەیەک خێراییش بڕۆن- چەند ئیحتیمالی لێک دانی ئەو دوو کەشتیە هەیە، ئەوەندەش ئیحتیمالی لێکدانی دوو ئەستێرە هەیە، کە ئەویشە هێجگار ئیحتمالێکی دوورە، ئەگەر موستەحیل و مەحاڵ نەبێت ..

لەگەڵ ئەوەدا کە لەنێوان ئەستێرەیەک و ئەستێرەیەکی تردا ئەو ماوە دوورو فراوانە هەیە، هەموو ئەستێرەیەک لە جێگای تایبەتی خۆیا دانراوە، بەجۆرێکی وا رێکخراوە لە کارکردن و کارتێکردنیا کە لەگەڵ هەموو ئەستێرەکانی ترا بگونجێ - وە هەموویان پێکەوە بتوانن ئەو ئەرکەی پێیان سپێرراوە- لە بنیاتنانی بوونەوەرو بزووتنەوەی- ئەنجامی بدەن..

با بەنموونە پەیوەندی نێوان خۆرو زەویو مانگ باس بکەین. وە بزانین چ ئەندازەکارییەکی پتەوی تیا ئەنجام دراوەو چۆن بەهۆی ئەو پەیوەندییەوە ژیانی ئادەمیزادو گیانداران لەسەر زەویدا پەیدابووەو تا ئەمڕۆیش هەر بەردەوامە؟!!

ئەم خۆرەی خۆمان تەنیا هەسارەیەکە لەنێوان هەزارەها هەسارەدا کە بووەتە هۆی گونجانی ژیان لەسەر زەویدا، وە قەوارەو چڕیو پلەی گەرماییو سروشتی تیشکەکانیو ئەندازەی دوورییەکەی لەئێمەوە، هەموو ئەمانە پێویستن بۆ بەردەوامی ژیان لەم ئەستێرەیەماندا کە زەوییە..

زانای پایەبەرز ( ا. کریسی مۆریسیۆن ) دەڵێ: گۆی زەوی لەماوەی بیست و چوار سەعاتدا جارێک بەدەوری تەوەرەکەی خۆیا دەسووڕێتەوە، یا بەتێکڕا نزیکەی هەزار میل لە سەعاتێکدا، ئێستا وادابنێ کە زەوی لە سووڕانەوەکەیا بەسەعاتێک سەد میل دەبڕێ.. بۆچ نا ؟! دەزانی ئەو کاتە چی روودەدات؟! ئەو کاتە شەوو رۆژمان دە ئەوەندەی ئێستا درێژتر دەبوو. تا لەم حاڵەتەدا خۆری

---

[٥٧] مدینة رانه .

[٥٨] المحيط الهادي .

گەرمی هاوین لە ڕۆژدا هەموو ڕووەک و کشتوکاڵێکی دەسووتاندین، ئەوەیشی بمایەتەوە بەهۆی سەرمای شەوەوە دەیبەست و سەرما دەیبرد..

ئەو خۆرەی کە سەرچاوەی هەموو ژیانێکە، پلەی گەرمایی ڕووبەرەکەی دەگاتە دوانزەهەزار[٥٩] پلەی فەهرەنهایەتی ، وە گۆی زەوی ئێمە بە ئەندازێکی وا لەم ئاگرە فراوانە دوورە کە بەئەندازەی پێویست گەرمایمان پێبگەیەنێت نەک زیاتر، وە ئەو ئەندازە دوورییەش بەجۆرێکی سەیر جێگیرو نەگۆڕاوە، وە گۆڕانێکیش کە لەماوەی ملیۆنەها ساڵ دا بەسەریا دیت، ئەوەندە کەمە زیانی نییە بۆ پایەداریو بەردەوام بوونی ژیان هەروەک دەزانین ) .

( ئەگەر پلەی گەرما لە گۆی زەویدا لەماوەی ساڵێک دا تێکڕا پەنجا پلە زیاد بکات، هەرچی ڕووەکە لەناودەچێت و نادەمیزادیش لەگەڵیا تیا دەچێت بەر سووتاندن یا بە ڕەق بوونەوە.. ) .

(گۆی زەوی لەماوەی چرکە (ثانية)یەکدا هەژدە میل دەبڕێت و بەدەوری خۆرا دەخولێتەوە، بۆ نموونە، ئەگەر خێرایی خولانەوەکەی لە بیاتی هەژدە میل شەش میل بوایە، یا چل میل بوایە لەچرکەیەکدا، ئەو کاتە دووریو نزیکیمان لە خۆرەوە بەجۆرێکی وا دەبوو کە هیچ جۆرە ژیانێکمان بۆ دەست نەدا . ) ..

(هەروەک دەزانین هەسارەکان لەقەوارەدا جیاوازن، هیوایان هەیە قەوارەکەی ئەوەندە گەورەیە، ئەگەر خۆری ئێمە بوایە، تەوەرەی گۆی زەوی ئێمە بەدەوری خۆرا لەسکی ئەو هەسارەیەدا جێگەی دەبووەوە) ( - ئەو ماوەیەی کە زەوی لەماوەی ٣٦٥ ڕۆژدا بەدەوری خۆرا دەیبڕێ تا دەورەیەک تەواو دەکات .. ئەو هەمرو مەوداو (مسافة)یە لەبەشێکی ڕووبەر (سطحي)ی ئەوهەسارەیەدا جێگەی دەبێتەوە .. جا ئیتر بیری لێ بکەرەوە بزانە چەند گەورەیە !! (وەرگێڕ) )..

وە هەروەها لەبارەی تیشکەکانیشەوە هەسارەکان وەک یەک نین، بەشێکی زۆر لەتیشکەکان کوشندەن و هەموو جۆرێکی ناسراوی ژیان لەناو دەبەن، وە چڕی (كثافة)و قەوارە (حجم)ی ئەو تیشکانەش لێک جیاوازن . هی وایان هەیە تیشکی لە تیشکی خۆری خۆمان کەمترە، هی وایشیان هەیە تیشکەکەی دەهەزار جار لەتیشکی خۆری خۆمان زیاترو زۆرترە..

(ئەگەر ئەم خۆرەی خۆمان نیوەی ئێستای تیشکی بۆ بناردینایە، هەموو دەبووینە سەهۆڵ و یەخ. خۆ ئەگەر نیو ئەوەندەی ئێستای زیاتری بۆ بناردینایە زۆر لەمێژبوو دەبووینە خۆڵەمێش !! ) .

(لەبەرئەوە دەبینین لەناو ئەو ملیۆنەها خۆرەی کە لەناو فەزادا پەرت و بلاون، بۆ ژیان ناگونجێن، تەنیا ئەم خۆرەی خۆمان بۆ ژیانی ئێمە دەگونجێ .)..

---

[٥٩] لە دەقە عەرەبییەکەدا هەزارو دووسەد پلە نووسرابوو، بەلام هەڵەو نیشتیباە بوو.. ڕاستییەکەی : دوانزەهەزار پلەی گەرمی فەهرەنهایەتییە.

## مانگ

مانگ ئەندازەی (٢٤٠٠٠٠) دووسەدو چل هەزار میل [٦٠] لە ئێمەوە دوورە، ئەو هەڵچوونەی رۆژی دووجار ئاوی دەریا هەڵدەچێ بەجۆرێکی ناسک مانگمان بیردەخاتەوە، ئەو هەڵچوونەی لە ئۆقیانووسەکاندا روودەدات جاری واهەیە لەهەندێک شوێندا هەژدە مەتر (شەست) پێ بەرزدەبێتەوە، وە بەهۆی هێزی کێشندەی مانگەوە، توێکڵی زەوی رۆژی دووجار، بەئەندازەی چەند سانتیمێک دەکشێت و دەردەپەڕێ بۆ دەرەوە ..

ئەزم و یاسا لەهەموو شتێکدا دەبینین ، بەجۆرێکی وا کەهەست بەو هێزە گەورەو فراوانە ناکەین، کە رۆژانە رووبەری تەواوی ئۆقیانووسەکان چەند پێیەک بەرزدەکاتەوە، وە توێکڵی زەوی کە ئێمە بە سەخت و رەقی دەزانین ، رۆژانە ئەو توێکڵەش کوورِ دەکاتەوەو دەیکێشێ ..

## مەریـــخ

گۆی مەریخ مانگی هەیە، مانگێکی بچووک [٦١] ، شەش هەزار میل لێی دوورە.. بۆ نموونە ئەگەر مانگی ئێمە پەنجا هەزار میل لێمانەوە دووربوایە، لەباتی دووسەدو چل هەزار میل ، هەڵچوون (المد) ئەوەندە بەهێز دەبوو، دەشتایی سەرزەوی هەر پێنج قارەکان رۆژی دووجار دەبوون بە ژێر ئاوەوە. وەتەوژمی ئەو ئاوە ئەوەندە بەهێز دەبوو، کێوەکانی خاپوور دەکردو دەیشۆردنەوە، لەو حاڵەتەدا هیچ کام لە قارەکانی زەوی فرسەتی ئەوەی نەدەبوو لەژێر ئاوەوە سەربێنێتەدەرو ناوێکی نەدەبوو، وە رووبەری زەویش لەژێر تەوژمی ئەو گۆڕانکارییەدا ورد دەبوو، وە ئەو هەڵچوون (المد)یش کارێکی وای دەکردە سەر هەوا، کە هەموو رۆژێ گێژەڵووکێکی سامناک لەسەر زەویدا بەدی بێنێت ). [٦٢]

دەبێت کێ ئەم هەموو دروستکراوانەی لەجێگەی دروستی خۆیانا دانابێت؟!، یا کێ قەوارەو مەوداو رێژەو پەیوەندی نێوانیانی بەو ئەندازە سەیرە پێەوە دیاری کردبێ؟! ئایا ئەو ماددیانەی ئینکاری بوونی خوا دەکەن، وەڵامێکی وایان لایە ئارام بەخشی دڵان بێ؟! سوکنایی بەدڵ بگەیەنێ؟! هەرگیز ..

بەڵام ئێمە وەڵامەمان پێیەو دەڵێین: بەدی هێنەری ئەو ئەزم و یاسایە (اللـە)یە، ئەو (اللـە)یەی کە ( هەموو شتێکی بەئەندازە دروست کردووە ) ( خلق

---

[٦٠] لە کتێبەکەدا بەهەڵەو ئیشتیباە چوارسەدو بیست هەزار میل نووسرابوو، بەڵام دروستەکەی ئەوەیە کە دووسەدو چل هەزار میلە وەک لە کتێبە زانیاریەکاندا هاتووە.. (وەرگێڕ)

[٦١] ئەوی ئاشکرایە مەریخ دوو مانگی هەیە . ( وەرگێڕ)

[٦٢] العلم یدعو للإیمان بەشی یەکەم ، جیهانی بێوێنەمان.

كل شي فقدره تقديرا)[٦٣] وه ( خوا بەدیهێنەری رۆژەو دەمی بەیانی کردۆتەوەو شەوی کردۆتە جێگەی ئارامیی‌و پشوودان و خۆرو مانگی بەحسێبێکی بێ زیادو کەم داناوە، ئەمەوە ئەندازەگیری خوای بەدەسەلات و زانایە..) )( فالق الإصباح ، وجعل الليل سكنا والشمس والقمر حسبانا، ذلك تقدير العزيز العليم)[٦٤]

## هەوا

ئەگەر وازبێنین لەئەستێرەو هەسارەکان و پەیوەندییان بە زەویو یەکترەوە، سەیری هەوا بکەین و لەو پەردە گازیە وردببینەوە کە چواردەوری زەوی داوە، زانیاری دەڵێ:

( کێش (وزن)ی ئەو هەوایەی کە بەزۆری لە ئۆکسجین و نایترۆجین پێک هاتووە، یەک بەشە لە میلۆن بەشی کێشی زەوی، ( واتە: ئەگەر کێش و وەزنی زەوی بکەینە یەک ملیۆن بەشەوە کێش و وەزنی هەوا بەئەندازەی یەک بەش دەبێ ( کە دەکاتە پێنج هەزار و نۆسەدو پەنجاو پێنج ملیار ملیار تەنە)[٦٥] چونکە وەزنی زەوی پێنج هەزارو پەنجاو پێنج ملیار تەنە).[٦٦]

- بەپێی ئەو بیردۆزانەی ئێستا هەن - مومکین بوو زەوی لەکاتی بەدیهاتنەکەیا هەڵی بمژێ.. واتە ئەو هەوایە هەڵمژێ، وە مومکینیش بو رێژەکەی زۆر زیاتر بێ لەوەی ئێستای، بەڵام لەم دوو حاڵەتەدا ژیان و بوونی ئینسان نامومکین دەبوو..) .

ئەستووری یا چڕی هەوا، شتێکی مەبەستەو بەئەندازە دیاریکراوە، چونکە: ئەگەر ( ئەو نیازکانەی کە رۆژی ملیۆنەها دانەیان بەرەو زەوی دێت و هەر لە فەزادا دەتەقێتەوەو ناگاتە زەوی -ئەگەر- هەوای دەوری زەوی لەوەی ئێستای ئەندازەیەک کەمترو تەنکتربوایە، ئەو نیازکانە دەکەوتنە سەر زەویو دەیان سووتاندو وێرانیان دەکرد. چونکە لەتوانایا هەیە هەرچی قابیلی سووتاندن بێ بیسووتێنێ، وە ئەگەر خودی ئادەمیزاد بچوکترین پارچەو تەڵەزمی ئەو نیازکانەی بەرکەوێ پارچەپارچەی دەکات، چونکە ئەو نیازکانە نەوەد ئەوەندەی گوللە تیژتر دەڕۆن، بگرە هەر بەپەنایا بڕوات گەرمایییەکەی دەیسووتێنێ..

( هەوای دەوری زەوی بەئەندازەیەک ئەستوورە کە رێگە لە تێپەڕبوونی ئەو تیشکانە ئەگرێت کە بۆ گەشەکردن و پێگەیشتنی رووەک و کشت و کاڵ پێویستن،

---

[٦٣] سوورەتی الفرقان ئایەتی ٢ .

[٦٤] سوورەتی الأنعام ئایەتی ٩٦ .

[٦٥] بڕوانە کتێبی ( الىسان وجهان ) لاپەڕە ٩٣ دانراوی استاذ حسین نوری . ( وەرگێڕ)

[٦٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو .

ئەو تیشکانەی میکرۆب دەکوژن و ڤیتامین دروست دەکەن، بێئەوەی زیان لە مرۆڤ بدەن، مەگەر ماوەیەکی زۆر خۆی بداتە بەر ئەو تیشکانە).[67]

ئەگەر تەماشای ئەو گازانە بکەین کە لە ژیانی رۆژانەمان دا هەڵیان دەمژین، دەبینین کە ئۆکسجین شنەی شەماڵی ژیانە بۆ مرۆڤ و هەموو گیانداریکی سەرزەوی، ئەم گازەش لەهەوادا نەبێ دەست ناکەویت، ریژەی ئەم گازە لەهەوادا نزیکەی بیست و یەک لەسەدە، ٢١٪.. ئەگەر لە بیاتی ئەم ریژەیە لەسەدا پەنجا، یا زیاتربوایە، چی رووی دەدا؟!

زانیاری دەڵێ: ( ئەو ماددانەی لەسەر زەویدا قابیلی سووتاندن بوونایە (معرض) دەبوون بۆ سووتاندن، بە جۆریکی وا ئەگەر گڕەی برووسکەیەک بەر درەختیک بکەوتایە، هەموو دارستانەکە دەسووتاو بگرە لەوانەبوو بتەقیایەتەوە).[68]

ئەوی ئاشکرایە هەرچی گیاندارە ئۆکسجین هەڵدەمژێ، وە دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دەداتەوە، بەڵام رووەک بەپێچەوانەوە دووەم ئۆکسیدی کاربۆن هەڵدەمژێو ئۆکسجین دەداتەوە، لەویادا گۆڕینەوەیەکی هاوبەش لەنێوان رووەک و گیاندارانا هەیە.. ئەوەی کە ئێمە دەری دەدەینەوە رووەک سوودی لێوەردەگرێ ..

وە ئەوەی رووەک دەری دەداتەوە ئێمە سوودی لێ وەردەگرین، ئەگەر ئەم ئۆکسجینە نەبێ؛ لەماوەی پێنج دەقیقەدا ژیانمان کۆتایی دیت ..

وە ئەگەر ئەم گۆڕینەوەو ئاڵ و گۆڕە نەبوایە، ژیان تا ئەمڕۆ نەیدەخایاندو بەردەوام نەدەبوو..

ئەگەر تەنیا گیانداران لەسەر زەویدا بوونایەو رووەک نەبوایە، هەرچی ئۆکسجین هەیە لەناو دەچوو، و ئێستا هیچی نەدەما..

وە ئەگەر تەنیا رووەک ببوایەو گیاندارانیتر لەسەر زەویدا نەبوونایە، دووەم ئۆکسیدی کاربۆنیش لەناودەچوو ، و نەدەما ..

لەهەردوو حاڵەتەکەدا ئەم ژیانەش دوایی دەهات، هەرکاتێ ئەم هاوکێشەیە بەتەواوی تیک بچیت: رووەک هەمووی وشک ببێ، یا مرۆڤ و گیانداران هەموویان بمرن، ئەوی تریان زۆری پێناچێ پێی دەگات و دەمرێ.

واتە: هەردووکیان تیا دەچن و ژیان کۆتایی دیت ).[69]

---

[67] العلم یدعو للإیمان بەشی دووەم ، هەوای دەوروبەرمان .

[68] هەمان سەرچاوەی پێشوو .

[69] العلم یدعو للإیمان ، بەشی سێیەم ، ئەو گازانەی هەڵیان دەمژین.

دەبێ کێ ئەم ڕێکخستنەی بەدی هێنابێو ئەم هاوکێشەیە بەرپاکردبێ؟ ئەم یاسا پوختە پتەوەی دانابێ؟ - جگە لە خوا_ ..

## ☐ ڕووەک و جانەوەران

خۆ ئەگەر وازمان لەجیهانی گازەکان هێناو ڕوومان کردە جیهانی ڕووەک و جانەوەران (النبات والحشرات) چەندەها ڕواڵەت و دیمەن بۆ ئەم هاوکێشەیىو ئەندازەگیرییەیە دەبینین (ا. کریسی مۆریسیۆن) لەبەشی (کۆنترۆڵ و هاوکێشە)ی کتێبەکەی خۆیا هەندێک لەو ڕواڵەتانەمان بۆ باس دەکات و دەڵێ: ( بەڕاستی جێگەی سەرسوڕمانە !! کە یاسای کۆنترۆڵ و هاوکێشە، هەر لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ نەیهێشتووەو نایەڵێ: گیانداران بەسەر جیهانا دەسەڵات پەیدا بکەن، هەرچەند ئەو گیاندارانە دڕندە، یا گەورەو قەبە، یا فێڵبازو لێزان بن ) .

( بەڵام مرۆڤ بەتەنیا توانیویەتی -لەناو گیاندارانا- ئەم هاوکێشەیەی هەڵگێڕێتەوەو ڕووەک و ئاژەڵ و گیانداران لە شوێنێکەوە بگوێزێتەوە بۆ شوێنێکیتر ، بەڵام زۆر بە خێراییش تۆڵەی قورسی لەسەر ئەو کارەی وەرگرتووە، وە دەردو نەخۆشی گیانداران و ڕووەکی پێ گەیشتووە.. وە ئەم نموونەیەی کە لەمەودوا باسی دەکەین زۆر بە جوانی ڕوونی دەکاتەوەکە پارێزگاری لەو کۆنترۆڵ و هاوکێشەیە چەند پێویستە بۆ پایەداریی بوونی مرۆڤ!!)

( چەند ساڵێ لەمەو بەر، جووتیارەکانی ئوستراليا، ڕووەکێکیان بەناوی (کاکتۆس)ەوە وەک پەرژین بەدەوری کشت و کاڵەکانیانا ناشت، لەبەرئەوە کە لەو سەردەمەدا جانەوەرێکی دژی ئەو ڕووەکە لە ئوسترالیادا نەبوو، ئەو دەرختە بەجۆرێکی سەرسام هێنەر گەشەی کردو، ڕووبەرێک بەئەندازەی ڕووبەری خاکی بەریتانیای داگیرکرد، زۆری هێنا بۆ دانیشتوانی شارو دیهات و، کێڵگەکانیانی وێران کردو، کاری کشت و کاڵی وەستاندن، دانیشتوانی وڵات نەیان دەزانی، بە چ وەسیلەیەک بەرگری لەبڵاوبوونەوەی ئەو ڕووەکە بکەن؟! ئوسترالیا لەمەترسیەکی گەورەدا بوو، کەلەشکرێکی گەورەی (کاکتۆس) بێدەنگ و سەدا داگیری بکات، بێ ئەوەی هیچ کۆسپێ لە ڕێگەیا بێت هێرشی دەهێناو دەهاتە پێشەوە) .

زانایانی جانەوەرناس تێکەوتن و بەهەموو جیهانا گەڕان، تاچارەسەرێک بۆ ئەم دەردە سامناکە بدۆزنەوە، لەئەنجام دا جانەوەر (حشرة)یەکیان دییەوە، کە ژیانی تەنیا لەسەر ڕەگ و ریشەی (کاکتۆس)ەو جگە لەو خواردنێکی تری نیە.. زۆر بە ئاسانیو خێراییش زاوزێ دەکات و پەرەدەستێنێو لە ئوسترالیاش دا هیچ دوژمنێکی ناسراوی نییە) .

( زۆری نەخایاند ئەو جانەوەرە زاڵ بوو بەسەر درەختی (کاکتۆس)داو هێرشەکەی وەستاندو پاشەکشەی پێ کرد، بە لەناوچوونی درەختی (کاکتۆس) ئەو جانەوەرانەش لەناوچوون، کەمێکی زۆر کەمیان نەبێ، کە بۆ کۆنترۆڵی ئەندازەی

بەرەسەندنی (کاکتۆس) ماونەتەوەو نایەڵن بۆ هەمیشە (کاکتۆس) جارێکی‌تر وەک جاران بڵاوببێتەوە، بەڵێ، خوا ئەم کۆنترۆڵ و هاوکێشەیە لەجیهاندا دروست کردووەو بۆ مانەوەی ژیانیش زۆر پێویست و بەسوودە) ..

بۆچ مێشوولەی (مەلاریا) دەسەڵاتی بەسەر جیهان دا پەیانەکردو نەبووە هۆی لەناوچوونی نەوەی ئادەمیزاد؟؟ خۆ باوو باپیرانمان بەو مێشوولەیە دەمردن، یا بەرگرییان لێوە دەست دەکەوت؟

هەر هەمان قسەیش بەرامبەر مێشوولەی زەردی (تا) دەگوترێ، کە لەسەردەمێکا نزیکی شاری (نیویۆرک) بووەوە، بۆچ دنیای وێران نەکرد؟. یا مێشی (تسی- تسی) خەوهێنەر[70]، بۆچ گەشەی نەکرد، تا بتوانێ لەناوچە گەرمەکەی خۆیەوە بڕوات بۆ ناوچەکانی ترو قڕ بخاتە رەگەزی ئادەمیزادەوە؟؟ .

ئەوەندە بەسە کە مرۆڤ بیهێنێتەوە یادی خۆی تا دوێنێی نزیک چارەسەرێکمان نەبوو، بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشیە کوشندەکانی وەک چاوەقووڵەو گرانەتاو چەندەها پەتاو میکرۆبی تر، وە هەروەها بیر لەوە بکاتەوە کە چ بێئاگاییەکی تەواومان بە دەستووری خۆپاراستن و تەن دروستی هەبوو!! کەچی رەگەزی مرۆڤ قڕی تێنەکەوتووە، تا باش بزانێ کە مانەوەی مرۆڤ لەگەڵ ئەو هەموو دەردو نەخۆشیو نەزانینەدا جێگەی سەرسوڕمانە!!)[71]

خۆ ئەگەر ئەمانەمان هەموو جێهێشت و بەرەو جەستەی مرۆڤ رۆیشتین و بیرمان لە ئەندام و دەزگاو **خانە** (سلوول)ەکانی کردەوەو وە سەرنجمان دا کە چ هاوکاریو یارمەتیدان و یەکخستن و هاوکێشەیەک لەنێوانیان دا هەیە حاڵی دەبووین، کە: چەند بە وردی ئەندازەگیری و چەن بە پتەوی تەگبیری بۆ کراوە!! بەجۆرێ سەیری لێ تەواو نابێ..

لەناو ئەم دەزگایانەدا دەمانەوێ دەزگای کەرەلووەکان (الغدد الصماء) بناسین، ئەو لووانەی پێش ئەوەی مرۆڤ بزانێ کارو ئەرکیان چییە هەزارەهاو ملیۆنەها ساڵ لەوە پێش تر ژیاوە..

زانیاری روونی کردۆتەوە ئەو لووانە کارگەیەکی کیمیایی بچکۆلانەن لەلەش دا، گرنگترین ئاوێتەی کیمیایی پێویست بۆ لەش بەدی دێنن، وە کاریگەرن لە چالاکیە جۆراوجۆرەکانی لەشدا، وە هێزو توانایەکی ئەوەندە کاریگەریان هەیە تەنیا بەشێک لە ملیار بەشی ئەو لووانە شوێنەوارێکی گەورەی هەیە لە جوستەو لەشی ئادەمیزاد دا، هەروەک زاینیاری روونی کردۆتەوە: ئەم لووانە بە جۆرێکی وادانراون، کە خۆیان سەرپەرشتی یەکتر دەکەن و خۆیان یەکتر

[70] ئەم مێشانە لە ناوچە زۆر گەرماکاندا نەبێت ناتوانن بژین..
[71] بەشی (کۆنترۆڵ و هاوکێشە) لەکتێبی (العلم یدعو للإیمان).

ڕێکٚ دەخەن و کۆنترۆڵی یەکتر دەکەن و کاری خۆیان یەکٚ دەخەن ، وە دەردان (افراز)ی هەر لوویەکٚ دەبێـە تەواوکەری دەردانی لوویەکی تر ) ..

مامۆستا ( ا. کریسی مۆریسۆنٚ) دەڵێ: ( زانایان لەو بارەوە یەکٚ ڕان : کە هەرکاتێ ئەم (دەردان)ە ئاڵۆزانە هاوکێشەیان تێکٚ چوو ، مرۆڤ تووشی چەندەها نەخۆشی سەخت و ناهەمواری لەشیو مێشکی دەبێ، خۆ ئەگەر تێکچوونی کاری ئەو لووانە بلاوەبکات و خەڵکی جیهان پێوەی گرفتار ببن، ئەو کاتە شارستانیەت لەناودەچێ و ئەگەر خەڵکی بیشمێننەوە مرۆڤایەتی تلێردەبێتەوە بۆ حاڵی جرۆجانەوەران و گیانداران (حیوانات).[٧٢]

دەبێ ئەم هەموو ئەندازەگیرییو بەرنا مەرێژەییە چۆن بەدی هاتبێت؟ ئەم هەموو تەگبیرە چۆن تەواو بووبێ؟! ئەگەر لەوێدا خوایەکی بالا دەست نەبووبێ، کە بەجوانترین شێوەی ئەندازەگیریی ئەندازەی گرتبێ و بە جوانترین جۆری تەگبیری بۆ کردبێ؟؟

## بەڵگەی ڕێنموونی ( دلیل الهدایە)

دروست کردنی ئەو شتانەی لەم بوونەوەرەدا بلاوبوونەتەوە، بەڵگەیە لەسەر بوونی خوا.. جوانکاری لە دروست کردنیاناو ڕێکٚ سازیشیان بۆ ئەوەی بتوانن ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام بدەن، بەڵگەیەکی ترە لەسەر بوونی خوا. وە دروست کردنی ئەم شتانەش بەجۆرێکی وا سازێنراوە و ئەندازەگیراوە کە تەرتیب و هاوکێشەو ڕێکخستن لەنێوان خۆیان و غەیری خۆیانا بەدی بێنێ ئەمەش بەڵگەیەکی سێهەمە لەسەر بوونی خوا..

بەڵگەی چوارهەم لێرەدا ماوەتەوە، کە ئەویش بەڵگەی ڕێنموونی (دلیل الهدایة)یە. چۆن هەموو شتێ لەم بوونەوەرەدا لەسەر شێوەیەکی وا دروست کراوە، کە لەگەڵ کارو فرمانەکەیا بگونجیو یارمەتی بدات بۆ ئەنجام دانی، ئاوەهایش ڕێنموونی کراوە: کە، بۆچی دروست کراوەو ئەرکی سەرشانی چییە؟! وە خراوەتە دڵیەوە: کە، ئامانج لە دروست بوونی چییە، وە ڕێگەی بۆ ئاسان کراوە تا بەوپەڕی کەماڵی بگات کەلەگەڵیا بگونجێ.. ئەمانەی باسمان کردن ڕێنموونین، ڕێنموونی (هدایة) حاڵەتێکە بانتر لە دروست کردن و ڕێکٚ سازیو ئەندازەگیرییەوە، ئەم حاڵەتە نیگاو فێرکردنە، چ ناوێکی لێدەنێی لیی بنێ، ئەوە ئەو ڕێنموونییەیە کە ئەندازەگیری پێ تەواو دەبێت و دەبێتە تەواوکەری بەدیهێنان و تەگبیریش.

---

[٧٢] بەشی (کۆنترۆڵ و هاوکێشە) لەکتێبی (العلم یدعو للإیمان).

ئەم ڕێنموونیی‌و (هدایە)، گشتیی‌یەو لە گیاندارو بێ‌گیان و ژیرو نادان و دەنگ دارو بێ‌دەنگی ئەم بوونەوەرەدا هەیەو بلاوبووەتەوە.. وەنەبێ هەر تایبەت بێ بە کەسانێ کە هۆشیارو ژیرن، یا ئەوانەی تەکلیفیان لەسەرەو (مکلف)ن.. نەء!. چونکە کاتێ باسی ڕێنموونی دەکرێ یەکسەر مرۆڤ وا دێت بە خەیالیا کە بۆ (مکلف)ان بێت. نەء. وەنەبێ هەر بۆ ئەوانە بێ کە لە جم و جووڵ و بزوتنەوەیان دا خاوەنی ویستن ، وەک : نادەمیزادو ئاژەڵ و پەلەوەرو جروجانەوەر، نەء.. بەڵکو بۆ هەموو شتێکە..

قورئان لەسەر زمانی حەزرەتی مووساوە ئەم حەقیقەتەمان بۆ باس دەکات، کاتێ ( فیرعەون) لێی دەپرسێ: ( ئەرێ مووسا، خوای ئێوە کێ‌یە؟) (فمن ربكما يا موسى) ؟[73]. لەوەڵام دا دەفەرموێ: ( ربنا الذي أعطى كل شيء خلقه ثم هدى)[74] واتە: خوای ئێمە ئەو زاتەیە کە هەرشتێکی دروست کردووە ڕێنموونیشی کردووە.

لە ڕواڵەتەکانی ئەم ڕێنموونیی‌یە:

## ا- گیانداران :

خوا هەر گیانداریکی دروست کردووە، دەزگاو هەستێکی تایبەتی وای پێ داوە کە یارمەتی دەری بێ بۆ ژیان و بەجێ‌هێنانی ئەرکی پێ‌سپێرراوی..

بۆ نموونە: باڵندەیەکی وەک هەڵۆ، چاوێکی وای پێ دراوە، دەڵێیت تەلسکۆبە[75]، کاتێ بە حەواوە پەروازدەکات ، دەتوانێ بچووکترین نێچیری خۆی لەسەر زەوی‌دا پێ ببینێ.

وە دەبێ لەناو جانەوەرە وردیلەکانیشا، هی‌وایان هەبێ، چاوی میکرۆسکۆبی[76] وای پێ درابێ، کە نازانین تا چ ئەندزەیەک وردەکاری تیا کراوەو بەتوانایە!!

وە ، دەبینین هەستی گەڕانەوە بۆ نیشتمان لە نادەمیزادا لاوازە، چونکە دەتوانێ ئەوهەستە لاوازەی بەکەسەرەی تری وەک مەلەوانیی‌و شتی‌وا بەهێزتر بکات.. بەلام ئەو هەستە لە کۆتری نامەبەردا بەهێزە، بێ‌ئەوەی قوتب نما (قیبلەنما) یا نەخشەیەکی پێ بێت، هەزارەها میل ڕێگە دەبڕێت و کەچی دەشتوانێ بگەڕێتەوە شوێنی خۆی. خۆ ئەگەر کاتێ ڕێی لێ هەڵە ببێت، ماوەیەک بەدەوری ئەو شوێنەدا دەسوڕێتەوەو ئنجا بێ ڕێ لێ تێک چوون ڕێگەی نیشتمانی دەگرێتەبەر..

---

[73] سوورەتی طه ئایەتی ٤٩ .

[74] سوورەتی طه ئایەتی ٥٠ .

[75] تەلیسکۆب واتا شت نزیک کەرەوە یا دووربین.

[76] میکرۆسکۆب واتا شتی زۆر وردبین، یا زەرەبین .

هەنگ ڕێ بە پوورەکەی خۆی دەباتەوە، هەرچەند باوبۆران، درەخت و پووش و پەڵاش و هەموو نیشانەیەکی دیاریکراوی لێ ون بکات..

باڵندەکان لە وڵاتێکەوە کۆچ بۆ وڵاتێکیتر دەکەن، بگرە لە قاڕەیەکەوە بۆ قاڕەیەکیتر، ئینجا بێئەوەی هەڵە بکەن بۆ شوێنیخۆیان دەگەڕێنەوە.

## *کۆچی مارماسی*

سەیرترین شتێ لەبارەی کۆچی گیاندارانەوە زانرابێ کۆچی مارماسییە (ماری ئاوی) ئەم مارانە کاتێ لەناو گۆم و رووبارە جۆراو جۆرەکانا پێ دەگەن، دەست بە کۆچ دەکەن. لەم کۆچەیاندا هەزارەها میل ڕێگە دەبڕن تا دەگەنەوە ئۆقیانووس و قوڵاییی زۆر قووڵی باشووری (بەرمۆدا)[77] لەوێ گەرا دادەنێن و دەگەڕێنەوە شوێنی خۆیان.

بەڵام بێچووەکانیان کە هیچ کەرەسەیەکیان نییە ڕێی پێ دەربکەن، هیچ نەخشەیەکیان پێ نییە، هیچ قوتب نمایەکیان پێ نییە، دایکیشیان لەلایان نەماوە تا لەگەڵ خۆیا بیانباتەوەو چاوساغییان بکات، چاویان کردۆتەوەو خۆیان لەناو دەریایەکی بێبنی بێ پایانا دیوەتەوە، کەچی ئەم توولە مارانە ڕێگەی کەناری دەریا دەگرنەبەرو دەگەڕێنەوە بۆ نیشتمانی خۆیان، بۆ ئەو شوێنەی دایکیانی لێهاتووە. بۆ گۆم و رووبارەکان.. ئەم مارماسییانە بەرەنگاری تەوژمە بەهێزەکان دەکەن، وە لەبەرامبەر بۆران و بای بەهێزا خۆ ڕاگیردەکەن، وە بەسەر شەپۆلی گەورەی دەریاکان دا زاڵ دەبن، بەڕێگایەکا دەڕۆن کە لەوەوپێش نەیان دیوەو شارەزای نین، لەگەڵ ئەوەدا دەگەنەوە شوێنی خۆیان، ئەو ئاوەی دایکیانی لێوە هاتووە، بێئەوەی جارێک رووبدات ماسییەکی ئەفریقایی لە ئاوێکی ئاسیاییدا، یا مارماسییەکی ئەورووپایی لە ئاوێکی ئەمریکاییدا، یا بەپێچەوانەوە ڕاو بکرێ..

ئایا ئەم هەستی لایەن گیریی و گەڕانەوەیە بۆ نیشتمان لەچ سەرچاوەیەکەوە هەڵدەقوڵێت؟!

(کاتێ ئەم ماسیانە وەختی گەراکردنیان هات و پێگەیشتن، جارێکیتر دەگەڕێنەوە بۆ نزیکی جەزیرەکانی بەرمۆداو لەوێ گەراکانیان دادەنێن، وە هەروەها ئەم پێچە بەدەورەیە بەردەوامە).[78]

---

[77] بەرمۆدا، کۆمەڵێ دورگەی ئینگلیسە لە ئۆقیانووسی ئەتلەسیدا، کەوتۆتە لای ژووررووی جەزیرەکانی ئانتیل، نزیکەی ٥١٠٠٠ کەس دانیشتوویەتی.

[78] ئەم ئەندازەیە لە دەقە عەرەبیەکەدا نیەوو، بەڵام کە سەرمان لە سەرچاوەکەدا (العلم یدعو للإیمان، بەشی هەستی گیانداران) لەوێوە هێنامان چونکە تەواوکەربوو بۆ ئەوەیتر. (وەرگێڕ)

لە جیهانی جانەوەرو باڵندەو گیانداران دا ، ئەوەندە بوار فراوانە، بۆ قسەکردن لەبارەی ڕێنموونیو هیدایەتەوە، کە ئینسان تیادا دەمێنێ: ئایا لەبارەی کامیانەوە بدوێ؟ کامیان باس بکات و کامیان وێڵ بکات ؟

## هەنگ

ئایا لێرەدا باسی ڕێنموونی لە ولاتی هەنگ دا بکەین ؟ کە چۆن نەخشەدەکێشنیو چ ئەندازیارییەک بەکاردێنێ بۆ دروستکردن و یەکخستن؟ چۆن لەناوخۆدا کار دابەش دەکەن؟ چۆن یارمەتی یەکتر دەدەن بۆ بەرهەم هێنان و پاراستن و پاسەوانی؟ ئەو کارانەیان کە قوتابیانی زانست لێی دەکۆڵنەوەو دەیخوێنن و نووسەران قەڵەمی خۆیان لەو مەیدانەدا غاردەدەن و باسێکی فراوانی تیا دەنووسن، ئایا باسی کام لایەن بکەن؟

لەم بارەوە قورئان هێمایەکی کردووە، وابزانم لەو بارەوە ئەوەندە بەسە بۆ باس کردن کە خوادەفەرموێ: ( وأوحى ربك إلى النحل أن اتخذي من الجبال بيوتا ومن الشجر ومما يعرشون ثم كلي من كل الثمرات، فاسلكي سبل ربك ذللا، يخرج من بطونها شراب مختلف ألوانه، فيه شفاء للناس، إن في ذلك لآية لقوم يتفكرون).[79]

واتە: پەروەردگارت نیگای بۆ هەنگ ناردو خستیە دڵیەوە کە : ماڵ لەکەژو درەخت و داڵیتا دروست بکات و لەهەموو بەروبوومێک بخوات، وە ڕیگەیێ بگرێتەبەر کە خوا بۆی رام کردووە.. هەنگوینێکی جۆراوجۆر -سپی، زەرد، رەش-ی لێ پەیدا دەبێت کە شیفا بەخشە بۆ خەڵکی، بێگومان لەوەدا بەڵگە لەسەر بوونی خوا هەیە بۆ کەسانێک بیربکەنەوە..[80]

## مێروولە

با باسی مێروولە بکەین کە چ هیدایەتێکی دراوە!! ( ئەو جانەوەرە کۆمەڵایەتیە)ی کە بەنموونەی یارمەتیدان و هاریکاری دەهێنرێتەوە، ئەو گیاندارە بچکۆلانەی کە یاسای (گەورەترین خێر بۆ گەورەترین ژمارە) جێبەجێدەکات.. وەرزی و ژیواری خۆی زەخیرە دەکات و لەعەمباری زەخیرەی ئاواییەکەیدا پاشەکەوتی دەکات، تا لە رۆژگای زستانا لەو کاتەدا کە کاسبیو هەوڵدان و لەماڵ هاتنەدەرەوە زەحمەت و نارەحەتەو سوودی لێوەرگرێ.

وە ئەو شتانەیش کە هەڵیدەگرێو پاشەکەوتی دەخات، ئەگەر لەوانەبێ چەکەرە بکات و سەوز ببێ، دەیکاتە دوو کەرتەوە، تا چەکەرە نەکات، خۆ ئەگەر بە لەت کراویش سەوزببێ، دەیکاتە چوار لەتەوە..

---

[79] سوورەتی النحل ئایەتی ٦٨-٦٩.

[80] لەکتێبی العلم يدعو للإيمان، بەشیهەستی گیانداران) لەو بارەوە زۆری باس کردووە، دەتوانی سەرێک لەوێ بدەیت.

خۆ ئەگەر تەڕبیێو لەوە بترسێ بۆگەن بکات و خراپ ببێ، چاوەڕوانی دەکات، تا هەلی بۆ هەڵدەکەوێو لە ڕۆژێکی خۆرەتاوا دەیباتە دەرەوەو لەبەردەم کونی شارەکەیا بلاوی دەکاتەوە، تا هەوا لیی دات، ئینجا دەیهێنیەوە ژوورێ، ئەرێ، کێ ئەمەی فێرکرد؟ کێ ڕێنموونی کرد؟

یەکیکیتر لە عەجایەباتی مێرووله ئەوەیە، هەرشتێ گیاندارانیتر بەچاو ببینن یا بەگوێ بیبیستن، ئەم بەهەستی بۆن هەستی پێ دەکات، ئەوەندە هەستی بۆنی بەهێزە، لە دوورترین شوێنەوە دیت بۆ ئەو شوێنەی مرۆڤ شتی تیا خواردووەو نانەووردەو پاشماوەی خواردنی تیا بەجێماوە، هەڵیدەگرێت و دەیبات، خۆ ئەگەر توانای پێ نەشکاو بۆی نەبرا، دەچێتەوە بۆ شارەکەیو کۆمەڵێ لە هاوەڵەکانی دینێت و وەک بە تاڵە بەنی ڕەش دەکەونە شوین یەکتر، تا کۆمەکی یەکتر بکەن بۆ هەڵگرتن و گواستنەوەی.

مێرووله وەک هەنگ پاشاو سەرۆکی نییە، بەڵکو پێشەوایەکیان هەیە، کە هەرگیز درۆیان لەتەکا ناکات. پێبزانێ لەهەرکوێ ژێواری هەیە، ڕووی تیدەکات و بەشوێن ڕۆژیدا دەگەڕێ، ئەگەر دەستیکەوت هەواڵ بەوانی تریش دەدات و ئەوانش -هەروەک باسمان کرد- بەکۆمەڵ دینەدەرو بەگەلکاری دەیبەنەوە.

هەموو مێروولەیەک هەوڵ بۆ بەرژەوەندی گشتی دەدات و قازانجی کۆمەڵەکەی دەوێت، سەیر لەوەدایە کە هەرگیز شت بۆ خودی خۆی لانادات تا بەدزییەوە بیخوات!!

## کۆتر

یا لەبارەی ڕێنموونی باڵندەیەکی وەک کۆترەوە بدوێین؟ ئەوکۆترەی نێرومێیان چون یەک زەحمەت دەکێشن و بەیەکسانی خزمەتی بێچوەکانیان دەکەن، دایەنیو پەروەردەکردن و پشتیوانی لەسەر دایکەیە، بەشی زۆری ژێواری بۆ هێنان وشت کردن بە دەمیەوە لەسەر باوکەیە، هەنگاو بەهەنگاو لەگەڵی دەڕۆن هەر لە خۆشەویستیەکی نەرمی هەڵۆلی تیکەڵ بەلیکی هەردووکیانەوە، تا دەگاتە شتی پتەوترو بەهێزتر لەوەش.. تا کاتێ کە دەزانن ئیتر بێچووەکانیان دەتوانن بە دەنووکی خۆیان دانەوێڵە هەڵگرن و بیخۆن، کەم کەم وازدێنن لە شت کردن بەدەمیانەوە، تا خۆیان خوو بە دان خواردنەوە بگرن..

کاتێ هەستیان کرد زیقەتۆرەیان فراوان و پتەوبووەو هێزی تەواویان بەسەر خواردنا دەشکێ، ئیتر بەتەواوی وازدێنن لە خواردن کردن بەدەمیانەوە -وەک دەڵێن: لەشیریان دەبڕنەوە. تا خۆیان هەوڵ بۆ خۆیان بدەن و خۆیان خۆیان بەخێوبکەن و بۆ ژێواری پەیداکردن زەحمەت بکێشن. ئەگەر وازیان نەهێناو داوای ژێواریان لێکردن -وەک لەمەوپێش- بەشی نادەن و بگرە لێیشی دەدەن، ئەو

بەزەیی‌و دڵۆڤانیەی لەوەپێشیان نامێنێ بەرامبەریان، سەرلەنوێ کاردەکەنەوە بۆ بێچووکردنێکی تر..

## یا لەبارەی ڕێنموونی‌و هیدایەتی گیاندارانی ترەوە بدوێین ؟

(ابن القیم) دەڵێ[81]: ( ڕێنموونی گیانداران بۆ بەرژەوەندی ژیان و ژیواریان وەک دەریا وایە، چۆنی لێ‌دەزانی باسی بکەو ترست نەبێ) هەر لەو کتێبەی ( )دا باسی هەندێ گیانداران دەکات و دەڵێ :

( کێ مێینەی درِندەی ڕێنموونی کرد: کاتێ بەچکەکەی بوو بەرزی‌بکاتەوەو چەند ڕۆژێک بیدات بە هەواداو بەم لاو لادا بیفڕێنێ تا مێروولەو مێروو تێی نەدا، چونکە لەوکاتەدا بێچوەکە وەک پارچە گۆشتێکی سوور وایە، دەترسێ مێروولەو مێروو تێی ورووشێن، بەردەوام هەڵی دەگرێ‌و دایدەنێ، لەم لاوە دەیبات بۆ ئەو لا، تا خۆی دەگرێ‌و هێزێ پەیدادەکات؟).

( شێر کە بەرێ‌دا ڕۆیشت و هەستی کرد کەوتوونەتە شوێنی‌و شوێن پێی هەڵدەگرن، کلکی دێنێ بەشوێن پێ‌یەکانیا، تا شوێنەواریان نەمێنی‌و دیار نەبێ، کێ ئەمەی فێری شێرکرد؟ ) .

( کێ ئەمەی فێری ڕێوی کرد: کاتێ برسی بوو، خۆی رابکێشێ‌و وا پیشان بدات کە مردووەو هەناسە لەخۆی ببڕێ‌و لەناوەوە گلی بداتەوە، تا بۆن بکات و باڵندەو قەل و داڵ وابزانن مردووەو بێنە سەر لاکەکەی‌و بیانەوێ بیخۆن، بەڵام ئەو لەناکاوە پەلاماریان بدات و یەکێکیان لێ بگرێ‌و بیخوات؟ ) .

( کێ فێری کرد : ئەگەر سەریەشەی تووش بوو، یا برینێکی لێ هات، بێ بۆ لای (ڕەنگێکی دیاریکراو)[82] لیی بخوات و وەک مەڵهەم بیخاتە سەر برینەکەی؟) .

( کێ فیلی مێنگەی فێرکرد لەکاتی زایندا بچێتە ناو ئاوێکی قووڵەوە، چونکە ناتوانێ بە راکشان و چیچکانەوە بزێ، دەبێ بەپێوەبزێ، ئەگەر لە وشکانیشا بەپێوە بزێ، لەوانەیە بێچوەکەی بکەوێ بەزەویداو بتلیشێت، لەبەرئەوە دەچێتە ناو ئاوەوە، تاکاتێ بەچکەکەی لێ‌کەوتەخوار ئازاری پێ‌نەگات ، وە لەهەمان کاتدا چلک و لیکەکەشی پێوە نەمێنی، کێ ئەم ڕێنموونییەی کرد؟

کێ چۆلەکەی فێرکرد : هاواربکات و بجیکێنێ؟ کاتێ بێچوەکەی کەوتە خوارەوە، تا هەرچی چۆلەکەی ئەو ناوە هەیە لیی کۆببنەوەو یارمەتی بدەن و بەدەوری بێچوەکەدا هەڵفڕن و بەکردەوەکەی خۆیان بیبزوێنن و هێزێکی خەیاڵی

---

[81] کتێبەکە ناوی (شفاء العلیل في مسائل القضاء والقدر والحکمة والتعلیل)ە.

[82] لە کوردەواریدا مەشهورە: (کەو) لەکاتی برینداربوونیا بە دەنووک بنێشتەتاڵ دەخاتەسەر برینەکەی‌و چاکی دەکاتەوە.

بۆ دروست بکەن و بیخەنە جم و جووڵ ، تـا ئـەویش لەگـەڵیان بکەوێــتە پـەروازو بفڕێ، کێ چۆلەکەی فێرکرد: ئەم دادو هاواره بکات ؟

نێرو مێی کۆتر، پێـش ئـەوەی بەچکـەیان ببـێ، پێکـەوە هێلانـە دروسـت دەکەن، لاوانەیەکی دیوار ناسای بـۆ دەسازێنن، ئینجا بەسـەر هێلکـەکان دا کـڕ دەکەون گەرمی دەکـەن، پاش چـەند ڕۆژێـک بـەدەنووک هـەڵیان دەگێڕنـەوە، تـا هێلکەکان دەتروکێن و سەر دێننە دەر، کێ ڕێنموونی کردن بۆ ئەم کارە؟

کۆتری نامەبـەر دەهـا میـل دەبـڕێ، بەشـەوا دەڕوات، بـەناو شـیوو دۆڵ و ناوەڕۆو دەشـتاییو کـەژو کێـوو ڕۆژهـەلات و ڕۆژئـاوادا دەڕوات، ئەگـەر ڕێـی لێ هەڵەبوو هەوڵدەدات بەو نیشانانە ڕێ بدۆزێتەوە، وە ئەگەر ڕێگەکەشی دۆزییەوە، وەک (با) دەفڕێ.. کێ کۆتری نامەبەری ڕێنموونی کرد ئەو شتانە بکاتە نیشانە؟..

کێ جاڵجاڵۆکەی فێرکرد : تۆڕێکی پتەوی بـەرز بچنـێو تـاڵێکیش بکـات بەلای سەرویەوەوخۆی پێوە هەڵبواسێو ئەگەر مێش یـا مێشوولەیەکی بەرکـەوت بەهۆی ئەو تاڵەوە بیگاتێو ڕاوی بکات؟

کێ ئاسـکەکێوی فـێرکرد: پشتاوپشـت بچێتـە نـاو لانەکەیـەوە، تـا لـەوە دڵنیابێ کە مەترسی بە شوێنیەوە نییە؟

کێ پشیلەی فێرکرد : کاتێ هەستی کرد مشـکێک بـە بنمیچـی سـەربانەوە دەڕوات سەری بەرزبکاتەوە؟ تا هێمایـەک بـێ بـۆ گێڕانـەوەی، بۆیـە ئـەم کـارەش بکات، تا سەرسامی بکات وئەویش هەڵبخلیسکێو بکەوێتە خوارەوەو بیخوات؟

کێ (گۆڕهەڵکەنە)ی فێرکرد : لەسەر کەن و شیوەکان دا کون هەڵکەنێ تـا ناوەڕۆی لافاو نەیگرێتەوەو بەردەست خـاک هەڵکـەنیش نەکـەوێ.. ئینجـا قوولـی بکات و چەند دەرگایـەکی بـۆ بکـات، بـەلام پەردەیـەکی تـەنکی بـۆ بهێڵێتـەوەو بەتەواوی کوناودەری نەکات، ئەگەر کاتێ هەستی بەمەترسی کـرد، بـە ئاسـانترین شت کونی بکات و لێی بچێتە دەرەوە، کێ ئەوەی فێرکرد ؟

چونکـە زۆر زوو شـتی لـەبیردەچێ، لـە پـەنای تەپۆلکـەو بـەردەوە نـەبێ کونەکـەی هەڵناکـەنێ، تـا ئەگـەر سـەری لێ شـێوا بـەو نیشـانانەدا خانوەکـەی بدۆزێتەوە. کێ ئەمەی فێرکرد ؟ ..

پاش ئەوە کە (ابـن القيـم) بـەدرێژی باسـی ڕێنموونـی گیـانداران دەکـات، دەڵێ: ئەم دەرگایە زۆر فراوانـە، ئـەوەندە بەسـە کـە خـوای تـەعالا لەبارەیانـەوە دەفەرموێ: ( ومـا من دابـة في الأرض ولا طـائر يطـير بجناحيـه إلا أمـم أمثـالكم، مـا فرطنـا في الكتاب من شيء، ثم إلى ربهم يحشرون)[83] واتـە: هەر گیـانداریکی پـادار بەسـەر زەویدا بڕوات و هەر باڵندەیـەک بـە بـاڵ بفـڕێ میللـەتانێکن وەک ئێـوە، تایفـە تایفـەی جۆراوجۆرن، ژێوارێو ئەجەل و حاڵیان لە (لـوح المحفـوظ)دا نووسـراوە، هیـچ شـتێک

---

[83] سوورەتی الأنعام ئایەتی ٣٨.

نیە لەبیرمان چووبێ‌و لەوێ دا نەمان نووسی‌بێ، جا ئێوەش ستەم لە خۆتان وگیانداران مەکەن، چونکە ئێوەو ئەوانیش لە رۆژی قیامەتاو لەبەر بارەگای خوایی‌دا کۆدەکرینەوە..

ئینجا باتەنیا پرسیارێک لە ماددیەکان بکەین: ئەو ئەتۆم و کەردیلانەی هەنگ و میرووولەو کۆترو شتانێکی تریشی لێ دروست بووە، چۆن توانیان پەی بەو کارە ئالۆزانە ببەن، بێ‌ئەوە بەدی‌هێنەرێکیان هەبێ‌و رێنموونییان بکات؟!

پێویستە لێرەدا ئەوە باس بکەین کە : زانیاری نوێ ئاگاداریيەکی فراوانی لەبارەی واتای هیدایەتەوە خستۆتە بەردەستمان، زیاتر لەوەی کە زانایانی پێشینمان بایەخیان پێداوەو ئاوڕیان لێ داوەتەوە: کە گیانداران رێنموونی کراون بۆژێواری‌و بەرژەوەندی‌و ئەوەی دەبێتە هۆی مانەوەو زۆربوونیان، لەبەر رۆشنایی زانیاری‌دا ئەهێنییەک کە لە واتای گشتی‌و بێ‌سنووری وشەی)(هدی)دا هەبوو بۆمان روون بووەوە، ( ربنا الذي أعطى كل شيء خلقه ثم هدى)[84].

## (ب) رووەک

لێرەدا بەدرێژی باسی ئەوە ناکەین کە رووەک چۆن رێنموونی کراوەو هیدایەت دراوەو لەو بارەوە چ عەجایباتێک هەیە..

تەنیا ئەوەندە بەسە کە سەرنج بدەین: هەرجۆرە رووەکێک چی بگونجێ لەگەڵیا، بەئەندازەیەکی تایبەت و بەرێژەیەکی دیاری‌کراو لە توخمەکانی زەوی هەڵدەمژێ، لەگەڵ ئەوەدا خاکەکە یەکێکە و توخمەکانی زەوی تێکەڵ و ئاوێتەن، ئەوەیان سوێرە، ئەوەیان شیرینە، ئەوی‌تر تاڵە، ئەو توونە، ئەوی ئەولا ترش و شیرینە، ...هتد، کەچی دەبینین دوو درەخت یا چەند درەختێ دراوسێن و پێکەوە لکاون، خاکەکەیان یەکێکە، ئاوەکەیان یەکێکە، هەواکەیان یەکێکە، تیشکەکەیان یەکێکە، سەرپەرشتی‌کەریان یەکێکە، بەڵام درەختێکیان رۆژێ هەڵە ناکات شتێک بگرێ کە هی خۆی نەبێت -سێو قەیسی ناگرێ‌و قۆخ هەرمێ ناگرێ‌و هەنجیر هەنار ناگرێ- یان لەبان پێویستەوە یا کەمتر لە پێویست بگرێ. ئەمەش حەقیقەتێکەو قورئانی موعجیزە تۆماری کردووەو دەفەرموێ :

( وفي الأرض قطع متجاورات وجنات من أعناب وزرع ونخيل صنوان وغير صنوان يسقى بماء واحد،ونفضل بعضها على بعض في الأكل، إن في ذلك لآيات لقوم يعقلون)[85]واتە: یەکێ لە نیشانەکانی دەسەڵاتی خوا ئەوەیە چەندەها پارچە زەوی بەتەنیشت یەکەوە دروست کردووە، بەڵام لە رەهۆڵی‌و پتەوییا، لە بەپیتی‌و بێ پیتی‌دا لێک جیاوازن، لەناوئەم پارچە زەوییانەدا چەندەها باخە مێو و کشت و کاڵ و داری خورمای تیا رواندووە، دارخورماکانیش هی وایان هەیە پێکەوە لکاون -جووتەن

---

[84] سوورەتی طه ئایەتی ٥٠.لە لاپەرەکانی پێشوودا مانامان کردووە.

[85] سوورەتی الرعد ئایەتی ٤.

هی وایشیان هەیە شەنگۆڵ نین و پێکەوە نەلکاون، لەگەڵ ئەوەدا کە یەک ئاو دەخۆنەوەو لە زەوییەک خۆراک هەڵدەمژن، دان و بەروبووم وشکڵ و قەوارەو تام وبۆنیان جیاوازە، لە خواردنی بەروبوومیانا ڕیزی هەندێکیان دەدەین بەسەرهەندێکی تریانا. بۆ کەسانێک عەقڵیان بەکاربێنن ئا لەوەدا باشترین بەڵگەو نیشانە هەیە لەسەر بوونی خواو دەسەڵاتی خوا ..

## ( چ )خانە زیندووەکان

ئەوەی لێرەدا باسی لێوە دەکەین و سەرنجی بۆ ڕابکێشین ئەوەیە: کە، زانیاری لەبارەی دروست بوون و کارو هاوکاری (خانە) زیندووەکانی لەشی زیندووەوە ڕێی پێ بردووە. چۆن ئەو خانانە ڕێی خۆیان دەدۆزنەوەو نیشانەی خۆیان دەپێکن و لەناو ملیۆنەها (ئیحتیمالات) دا هەڵە ناکەن ؟!

بێگومان هەریەک لەئێمە میللەتێکە، بگرە چەند میللەتێکی ڕێکخراوە لە میلۆنەها، یا ملیارەها خانە.. هەر خانەیەک هاونیشتمانییەکی ساڵحەو لەوپەڕی دەست پاکیو زیرەکیو لێزانیدا خزمەتی خۆی بەتەواوی دڵسۆزیەوە ئەنجام دەدات ..

هەر خانەیەک لەو خانانەی ژیان، کارێکی تایبەتی خۆیان هەیە، کە، لە هیچ خانەیەکی ترا ئەو تایبەتیەی نییە لەجیهانی ماددەدا، یەکەمین تایبەتی ئەوەیە : توانای دووبات بوونەوەو جۆراوجۆریو ناتەواوی پڕکردنەوەو پارێزگاریکردنی جۆری هەیە.

هەر جۆرێک لە جۆرەکان، چ جۆرە تایبەتییەکی هەبێ، هەر بەو شێوەیە توانای تازەکردنەوەی دەبێ، هەموو خانەیەک لە لەشدا بەو جۆرەی کە پێویست بێ کاردەکات. هەموو خانەیەک بەوجۆرەی بەرژەوەندی لەشی تیابێ، کاری خۆی ئەنجام دەدات، بەهاریکارییەکی بێ وێنە لەگەڵ خانەکانی ترا، کەژمارەیان خەملێنراوە بە ژمارەی هەموو تۆخمی ئینسان لەسەر زەویدا. وە هەموو خانەیەکیش ئاگای لە خانەکانی تر هەیەو دەزانێ داوای چی دەکات و چی پێویستە. هەرکامێکیان بەهۆی نەخۆشییەوە یا ناتەواوییەک کە بۆی پەیدا دەبێ، ئەگەر ڕێی لێ هەڵەبێت، ئەوانی تر هەڵەکەی بۆ ڕاست دەکەنەوەو ڕێگەی لێ ون بووی پیشان دەدەنەوەو ڕێنموونی دەکەن ..

ئەو خانانەی کە ڕۆژانە تێک دەچن یا هەڵدەوەشێنەوە لە ئەنجامی زەحمەت و کارکردنا، دەنێررێن بۆ ئەو شوێنەی کە جێگەی پاشەڕۆو شتی بێ سوودە، ئینجا سەرلەنوێ بەهۆی خواردنەوە لەش قەرەبووی بۆ دەکرێتەوەو کۆمەڵێکی تر دێنە جێگەی ئەو لەناوچووانەوە...

هەریەکێ لە ئێمە تووشی ئەوپەڕی سەرسامی دەبێ، ئەگەر سەرردی سەرنجێکی خاڵی سەرەتای مێژووی خۆی بدات، سەرنجی نوتفە بدات، خانەی سەرەتایی سادەن ئەو خانە (خلية + سلول) پیتێنراوەی (ملقح) کە بە میکرۆسکۆپی ئاسایی نابینرێ. بڵقی ئاوێکێ هەزارەها هەزار لەوانەی تێدایە.. با بزانین زانیاری لەبارەی ئەو یەک خانەیەوە چ دەڵێ؟ چۆن دەڕوات بۆ دروست کردنی ساختمانی لەشی مرۆڤ ؟؟ وە ئەم خانەیەی کە خۆراگیری نییەو هۆش و تواناو ویستێکی نییە، چ جۆرە ڕێنموونییەکی پێ بەخشراوە؟ وە چۆن هیدایەت دراوە ؟؟

هەر لەگەڵ لەمناڵ دانا جێگیربوو، خێرا دەست بەکار دەبێ، بۆ گەڕان بەشوێن خۆراکێ دا.. ڕێنموونی خوایی خاسیەتی خواردنی پێ دەبەخشێ، دیواری مناڵ دان بەدەوریا دەبێتە گۆمێکێ لە خوێنی شل و ئامادەکراو بۆ خۆراکی تازەو نوێ.. هەر لەگەڵ دڵنیا بوو لە خۆراکەکەی، کارێکی تازە دەست پێ دەکات.. کاری دابەش بوونی بەردەوام.. چەندەها خانەی تری لێ پەیدا دەبێت. وە ئەم خانە سادەیە دەزانێ چی دەکات! دەزانێ چی دەوێت!! ڕێگە دەزانێو بەرەو ئامانج دەڕوات!!

ئەو خانەیە ئەرکی سەرشانیەتی کە هەر کۆمەڵێکێ لەو خانە تازانە تایبەت بدا بۆ دروست کردنی گۆشەیەکێ لە گۆشەکانی ساختمانی گەورەو فراوانی لەشی ئادەمیزاد.. ئەو کۆمەڵە خانەیە ئەشێ کاریان دروستکردنی پەیکەری ئێسکی بێ؛ ئەو کۆمەڵەیەش دەبێ دەزگای ماسولکەیی بەدی بێنن، ئەو کۆمەڵەی تر کاریان دروست کردنی دەزگای دەمارو ڕەگەکانە، ئەو کۆمەڵەیتر دەزگای لیمفاوی دروست دەکات.. تا دوایین پایە سەرەکییەکانی ساختمانی لەشی مرۆڤ تەواو دەبێ..

بەڵام وەنەبێ کار ئەوەندە ئاسان بێ.. لەوێدا وردەکارییەکێ لە پسپۆڕیدا هەیە.. هەر ئێسکێکێ لە ئێسکەکان وە هەر ماسولکەیەکێ لە ماسوولکەکان، وە هەر دەمارێ لە دەمارەکان لەویتریان ناچێ.. چونکە ساختمانەکە بە وردی دروست دەکرێ، بەجۆرێکی سەیرو عەجیب دەبێ، ساختمانەکە کاری جۆراو جۆری دەبێ، ئینجا هەموو کۆمەڵێکێ لەو خانانە بە نەزم و تەرتیب بۆ دروستکردنی پایە سەرەکییەکانی ساختمانەکە دەست بەکار دەبن و دەبنە چەندەها دەستەی پسپۆڕی، هەر دەستەیەکیان لە بەشی پسپۆڕی خۆیا، هەڵدەستێ بە ئەنجام دانی جۆرە کارێکی دیاریکراو لەو ساختمانە گەورەیەدا ..

هەر خانەیەکی بچووکێ کاتێ دەست بەکار دەبێ، ڕێگای خۆی دەزانێت، دەزانێ بۆ کوێ دەچێت و چی لێ داوا کراوە، لەو بێڕێگا (متاهة) ناهەموارەدا تەنیا یەکێکیان ڕێ ون ناکات!! ئەو خانانەی دروستکردنی چاویان پێ سپێرراوە، دەزانن چاو دەبێ لەڕووی سەرا بێت، هەرگیز نابێ لە (سکێ) یا (لاق) یا

(باسک)دا بێت. لەگەڵ ئەوەدا هەموو جێگەیەک لەو جێگایانە دەگونجێت (چاو) گەشەی تیا بکات و پێ بگات ..
خانەی یەکەم کە دروست کردنی چاوی پێسپێرراوە، ئەگەر بیگیرت و لەهەر شوێنێک لەو شوێنانەدا بیچێنیت و دای بنێیت ، چاوێکت بۆ دروست دەکات!! بەڵام خودی ئەو خانەیە کاتێ دەست بەکار دەبێ بۆ جێگایەکیتر ناچێت، جگە لەو جێگە تایبەتەی دانراوە بۆ چاو لە دەزگای لەشی ئاڵۆزی مرۆڤ دا!! دەبێ کێ پێی وتبێ: ئەو دەزگایە لەو جێگەیەدا پێویستی بەچاو هەیە؟! دەبێ کێ چاودێری بکات و ئاراستەی بکات و رێگەی پێ نیشاندا، لەو (بێڕێگا)یەیدا، کە هیچ نیشانەو رێنیشاندەرێکی تیا نییە؟!
گرۆی هەڵگری سیفاتی رەچەڵەکی، کە پێیان دەگوترێ: (جین، و جینات) چ ئەخشەو بەرنامەیەکیان هەبێ؟ هەموو ئەو خانانەش تاک تاک و کۆمەڵ لەو چوارچێوەیەدا کاردەکەن، ئەو جیناتانەش پارێزگاری لە رەچەڵەکی مرۆڤ دەکەن و سیفاتی میراتی باوباپیران دەپارێزن و دەیان گوێزنەوە بۆ نەوەکان .
خانەی چاو دابەش دەبێ و زۆر دەبێ بۆ پێکهێنان و دروست کردنی چاو، لەم کاتی دروست کردنەدا هەوڵ دەدەن، پارێزگاری لە وێنەو شکڵێکی دیاریکراوی چاو بکەن و سیفەتە تایبەتەکانی بپارێزن و بیکەنە چاوی مرۆڤ، نەک چاوی گیاندارێکی تر .. مرۆڤێک کە چاوی باوباپیرانی وێنەیەکی تایبەت و سیفاتێکی تایبەتی هەبووە.. کەمترین لادان لە دروستکردنی ئەو چاوەدا لەبارەی وێنەو سیفەتەوە لەهێڵی دیاریکراوی خۆی لای دەدات. ئەو خانەیە خانەیەکی سادەیە، بێهێزو بێژیرییە، بێهەست و ویست و بێتوانایە، دەبێ، کێ ئەو توانایەی تیا دانابێ‌و ئەو زانیاریەی فێرکردبێ؟! دەبێ کێ ئەئەوەی فێرکردبێ، کە: هەرچی مرۆڤ هەیە لە دروست کردنیا بەیدەست و زەبوونن؟!
نەک هەر زەبوونن لە دروستکردنی هەموو دەزگاکانی لەشی مرۆڤێک دا بەڵکو ئەگەر دروست کردنی چاوێک، یا بەشێک لە چاویشیان پێبسپێررێ هەر زەبوونن و ناتوانن!! کەچی خانەیەک یا کۆمەڵە خانەیەکی سادە، لە لەشی مرۆڤدا هەڵدەستن بەو کارە گەورانە!!
دەبێ کێ ئەو توانایەی تیا دانابێ‌و ئەو زانیارییەی فێرکردبێ؟ دەبێ کێ رێنموونی کردبێ، ئەو کارە گەورەیە تاوەها ئەنجام بدات ؟؟
ئایا ئەو ماددیانەی نینکاری بوونی خوادەکەن، وەڵامێکیان بۆ ئەو پرسیارە، نەء... نەء ئەو پرسیارانە پێیە؟؟
ئایا تەفسیرێکی دروستیان هەیە بۆ ئەو رواڵەتانە؟!
بێگومان وەڵامیان دەست ناکەوێ‌و تەفسیرێکیش لەو بارەوە نازانن، مادام ئەوان لەو وەڵامە حەتمییە هەڵبێن کە جگە لەو وەڵامێکی تری نیەو جگە لەو تەفسیرە پێویستە (ضروري)یەش تەفسیرێکی تری نیە، کە ئەویش بوونی خوایە..

## ئێستا هەڵوێستی ماددییەکان چییە ؟

پاش ئەم پیشاندان و روون کردنەوەیە، ئەو ماددیانەی ئینکاری بوونی خوا دەکەن، دەبێ ئێستا هەڵوێستیان لە بەرامبەر راستەکانی بوونەوەرو ئایەتە گۆیاکانییەوە، چی بێ؟ لە بەرامبەر بەڵگەکانی بوونەوەردا -بەھەر چوار بەشەکەیەوە- دەبێ هەڵوێستیان چی بێ؟ ئایا ئینکاری بەدی هێنان لەم جیهانەدا دەکەن؟! یا ئینکاری ریکُ سازیو سازاندنی دەکەن؟! یا ئینکاری ئەندازەگیریی ونەزم و یاسا دەکەن؟! یا ئینکاری رێنموونیو نیگا دەکەن؟!

ئەوان ئەگەر ئینکاری ئەو بەڵگانە بکەن، وەکُ ئەوە وایە ئینکاری شتی بینراوو بەڵگەنەویست و هەست پێکراو بکەن، وە بەو کارەیان ئینکاری هەموو شوێنەوارێکی زانیاریو تاقیکراوەکانی و تێبینییەکانی دەکەن..

یا لەوانەیە ددان بنێن بە : بەدیهێنان و رێکسازیو ئەندازەگیرییو رێنموونیدا ئیتر لەویادا بوەستن.

باشە، ئەوان پەنا دەبەنە بەر چ ژیربێژییەکُ؟ یا پاڵ بە چ بەڵگەیەکی زانیاریەوە دەدەن؟!

ئایا بەدیهێنان بێ بەدیهێنەر دەبێ؟ ئایا رێکُ سازی بێ سازێنەر دەبێ؟ ئایا ئەندازەگیریی بێ ئەندازەگر دەبێ؟ ئایا رێنموونی بێ رێپیشاندەر دەبێ؟

ئەوان هەرچەند سەرلەخۆیان بشێوێنن، بەڵام ژیریو زانیاریو بینایییو ژیربێژی خۆی بۆ ناگیرێو بێ پەروا ئەم فەرمودە خواییە دەخوێنێتەوە:

( سبح اسم ربك الأعلى الذي خلق فسوى، والذي قدر فهدى)[86]

واتە: ( بەناوی پەروەردگاری باڵادەستەوە تەسبیحات بکە، ئەو پەروەردگارەی بوونەوەری بەدیهێناوەو رێکُ سازیشی تیا ئەنجام داوە، ئەو پەروەردگارەی ئەندازەی کارو رۆژیو ئەجەل و مەبەستی هەموو شتێکی لەم بوونەوەرەدا دیاری کردووەو رێنموونیشی کردوون ) .

## گومانی رێکەوت



ئەو ماددییانەی ئینکاری بوونی خوا دەکەن، پێیان وایە و دەڵێن: وە نەبێ عەقڵ بوونی ئەو خوایە - کە باوەڕداران باوەڕیان پێیەتی- بەشێکی پێویست

---

[86] سوورەتی الأعلی ئایەتی ١-٣ .

بزانێ بۆ تەفسیرکردنی بەدیهێنان و ڕێک سازیو ئەندازە گیریو ڕێنموونی هەموو شتێکی ئەم جیهانە.. چونکە دەگونجێ (ممکن) ئەم دنیایەو هەرچی تێدایە، هەر لە ژیان و ژیربییەوە بیگرە، تا دەگاتە وردەکاریو یەکخستن و هاوکێشەی نێوانیان کە بەیاسایەکی پتەوو وردەکاری تیاکراو دانراوەو دەچێ بەڕێوە- ئەوان دەڵێن:- تەنیا بەهۆی ڕێکەوت و تەصادوفەوە بەدیهاتووەو دەچێ بەڕێوە!!

بۆ پشت گیری بۆچوونەکەیان نموونەیەکیان هێناوەتەوەو گوتوویانە: باوەڵێک (صندوق) پڕیەتی لە بیست وهەشت پیتەکەی زمانی عەرەبی، ئەم پیتانە صەدەها جارو هەزارەها جارو ملیۆنەها جار ڕێک دەخرێن و ڕێکخستنەکەیان بە درێژایی ڕۆژگار دووبارە دەبێتەوە کە لەژمارە نایەت نە بە ساڵ و نە بە سەدەکان، مادان ئەم دووپات بوونەوەیە ئاوەها بەردەوام بێ، هیچ مانیعێک نییە جارێک لەو جارانەی یەکخستنی پیتەکان، وتارێکی جوان، یا پارچە شیعرێکی قەشەنگی لێ دروست ببێ، وەلەم یەکخستنەیش دا قەصدو مەبەست هیچ کارێکی تیا نەکردبێ جگە لە ڕێکەوت، واتە: تەنیا بەڕێکەوت ئەو وتارە یا ئەو شیعرە دروست بووبێ!!

*ئێمەش بەم جۆرە وەڵامیان دەدەینەوە:*

*یەکەم:*

سروشتی ئادەمیزاد باوەڕی بە هۆکاری (سببية) هەیە، بەبێ‌ئەوەی دەرزی دا بدرێ یا فێربکرێ، لەو بارەوە باوەڕێکی سەرەتایی هەیە، لەبەرئەوەبێ ڕۆچوون و داچوون ڕێکەوت بەدژی سروشتی لەقەڵەم دەدات.

جا، باوەڕ بەبوونی خوا هەستێکی قووڵ و بەهێزە لەناخی دەروون داو ئێمە پێی دەڵێین: سروشت (فطرة) هەر ئەوەی ئەو هەستەی لەقەوارەی مرۆڤدا داناوە یاسایەکی جێگیریشی لەعەقڵیا داناوە تا ڕێنموونی بکات بۆ لای خواو خوای پێ بدۆزێتەوە، ئەو یاسایەش بە یاسای (هۆکاری) (السببية أو العللية) دەناسرێ..

واتای ئەم یاسایەش وایە: عەقڵی مرۆڤ بێ دەرزدان و فێرکردن لێی روونە کە لەم بوونەوەرەدا هەمووشتێ هۆیەکی هەیە. وە هەموو کارێک بکەرێکی هەیە، وە هەموو شوێنەوارێک شوێنەوەرێکی هەیە، وە هیچ شتێ بێ هۆ نابێ..

ئەمە ڕاستەقینەیەکە و لە خودی خۆمانا هەستی پێ دەکەین، بێ‌ئەوە منداڵەکانمان فێرکردبێ، ئەو هەستەیان تیا دەبینین، هەر هۆی ئەوەیە دەبینین منداڵ زۆر پرسیار دەکات و هۆی هەموو شتێ دەپرسێ، هۆی یەک بەیەکی ئەو شتانە دەپرسێ کە بەدەورووبەران، منداڵی وا هەیە دایک و باوکی ماندوو دەکات، ئەوەندە پرسیاری زۆریان لێ‌دەکات: هۆی ئەوە چییە؟ هۆی هۆکەی چییە؟ هەر دەپرسێ تا دەگاتە قەناعەت و دڵی ئاو دەخواتەوە.. ئەمانە هەمووی لەبەر ئەوەن کە عەقڵی سروشتی (فطري) باوەڕی بە هۆکاری هەیە لە پەیدابوونی شتەکان دا،

باوەڕی نییە هەروا بەتێکەو لێکەو هەرچیو پەرچی  بووبێ، باوەڕی نییە کە بە هەڵدەگرێو ڕێکەوت و هەوانتە بچێت بەڕێوە..

ئەگەر عەقڵی تازە پێگەیشتوویەک هەستی بەیەک پارچەیی بوونەوەر کردو لە قۆناغی وردەوات تێپەڕی ، ئینجا پرسیارە گەورەکەی دەپرسێ، کە هەر مرۆڤێک بۆ ئەوە دروستکراوە ئەو پرسیارە بکات و وەڵامیشی بدرێتەوە. پرسیارە گەورەکەش ئەمەیە: کێ ئەم بوونەوەرەی دروست کردووە؟

بێگومان یاسای (هۆکاری) نێژراو لە سروشتیا وای لێدەکات ئەو پرسیارە بکات و بڕوای نییە ئەم بوونەوەرە لەخۆیەوەو بێ بەدیهێنەرێ بووبێ، جا ئەوەی بەدی هێناوە کێیە؟

شتێکی سروشتییە بەدیهێنەر نە منم و نە تۆیت و نەهیچ نادەمیزادێکە. چونکە ئێمە خۆمان دروست کراون و بەی دەستین و زەبوون، پێویستمان بە زاتێک هەیە بەدیهێنەر بێ ئەک بەدی هێنراو، بە توانا بێ نەک زەبوون، ئەو زاتەش (الله)یە..

نایش گونجێ بگوترێ: هەرچی لەم بوونەوەرەدا هەیە ناتەواوەو تەواوو کەماڵیش لە هەموو بوونەوەرا بەدی دیت.. چونکە ئەم قسەیە وەک ئەوە وایە بگوترێ: کۆی ناتەواو تەواوە!! واتە: ئەندامەکانی بوونەوەر هەموویان ناتەواون و بە کۆکردنەوەی هەموویان تەواوێک دروست دەبێ!! یا ئەو شتانەی کۆتاییان هەیە، کۆکردنەوەیان شتێکی بێکۆتایی لێ پێک دیت، کۆکردنەوەی کەم وکوڕییەکان، هێزێکی بێ کەم وکووڕی لێ دروست دەبێت، ئەگە رئەو شتانەی لە بوونەوەردا هەن، بوونەکەیان لەبەر خاتری خۆیان پێویست نەبێ، دەبێ هۆیەک ببێ کە بیانکاتە پێویست، وە بوونەکەی ئەوەستێ لەسەر بوونی هۆیەکیتر جگە لە خۆی ..[87]

ئەمەش هەمان ئەنجامە کە کابرای دەشتەکی هەزار ساڵ پێش تر زۆر بە ئاسانی و سادەیی دەریبڕیوە لە وەڵامی ئەو کەسەدا کە پرساری لێ کردووە: چۆن دەزانی (خوا) هەیە؟ ئەویش دەڵێ: ئەم پشقلە بەڵگەیە لەسەر بوونی وشترێک، جێگای پێ، بەڵگەیە لەسەر ڕۆشتنی کەسێک، ئەی ئەم ئاسمانە کەلوو (بورج)دارانە، ئەم زەویە (دەربەند)(فجاج)دارانە، ئەم دەریا شەپۆل دارانە، بەڵگەنین لەسەر خوای گەورەی بەرزی خاوەن دەسەڵات؟!

لەسەرەتاوە قورئان لەناو میللەتی عەرەب دا هاتۆتەخوار، لەبەر ئەوە دەبینین سەرنجمان بۆ شتانێک ڕادەکیشێ کە بەدەوری خۆیان دا هەبووە، تا بەهۆی ئەوانەوە ڕێگەی خواناسی بدۆزنەوەو باوەڕ بە خوای تاک و تەنیا بێنن،

[87] لە کتێبی ( اللـه) نووسراوی مامۆستا (عباس محمود العقاد)لاپەڕە ١٤.

بۆیەی دەفەرموێت: ( أفلا ينظرون إلى الإبل كيف خلقت ؟ وإلى السماء كيف رفعت وإلى الجبال كيف نصبت؟ وإلى الأرض كيف سطحت؟ ).[88]

واتە: ئایای سەرنج نادەنە وشتر چۆن دروست کراوە؟ یا ئاسمان چۆن بەرزکراوەتەوە؟ یا کێوەکان چۆن دانراون ؟ یا زەوی چۆن راخراوە؟

بۆ تەفسیری دروست بوونی ئەم جیهانە، عەقڵ باوەڕ بە بوونی خوا بەپێویست دەزانێ.

قورئان پرسیارێک دێنێتە پێش، ئەگەر باوەڕ بە بوونی خوا نەبێ وەڵامی ئەو پرسیارە چەواشەو شپرزەو بێوەڵام دەمێنێتەوە، پرسیارەکەش ئەمەیە: ( أم خلقوا من غير شيء؟ أم هم الخالقون؟ أم خلقوا السماوات والأرض؟)[89] واتە: ئایا بێئەوەی خالقێ دروستیان بکات دروست بوون؟ ئایا خۆیان، خۆیان دروست کردووە؟ ئایا ئەوان ئاسمانان و زەویان دروست کردووە؟

ئاشکرایە، کە خۆیان، خۆیان دروست نەکردووەو بێ خالقیش دروست نەبوون، وە هیچ کەسێکیش نەیتوانیوە بڵێ: من ئاسمانان و زەویم دروست کردووە، نە خۆیان و نە پێشینانیان نە دوای خۆیشیان.. کەوابوو خالقەکەی دەبێ کێ بێ؟

بۆ ئەم پرسیارە تەنها وەڵامێک هەیە، مرۆڤ و ئەگەر وازی لێبهێنرێ، هەر خۆیو خۆی بێ، ناچار دەبێ هەر هەمان وەڵامی دەشتەکیەکە بداتەوە یا وەڵامی خودی بت پەرستە (مشرک)ەکان بداتەوە، کاتێ: ( لئن سألتهم من خلق السموات والأرض وسخر الشمس والقمر؟ ليقولن الله، فأني يؤفكون؟!)[90] واتە: ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت، کێ ئاسمانان و زەوی دروست کردووەو خۆرو مانگی رام کردووە؟ دەڵێن: اللە، ئیتر چۆن بوختانی وا دەکەن؟ و بت دەکەن بە شەریکی خوا؟

یا ( ولئن سألتهم من نزل من السماء ماء، فأحيا به الأرض من بعد موتها ليقولن : الله، قل الحمد لله،بل أكثرهم لايعقلون)[91] وە ئەگەر لێیان بپرسیت: کێ ئاو لە ئاسمانەوە دەبارێنێو دوای مردن زەوی پێ زیندوو دەکاتەوە؟ دەڵێن: اللە، بڵێ: کەوابوو سوپاس بۆ خوا، بەڵام بەشی زۆریان عەقڵیان بەکارناهێنن..

ئەم وەڵامەش هەمان وەڵامە کە زانایانی ناوداری ئەمڕۆی زانیاری نوێ داویانەتەوە، یەکێک لەو زانایانە دەڵێ: ( زۆر بە ئاشکرا زانیاری دەیسەلمێنێ کە ناگونجێ ئەو بوونەوەرە هەربوو (ازلي) و هەربێ (ئەبەدی) بێ، وە نەبێ

---

[88] سوورەتی الغاشیة ئایەتی ١٧-٢٠.

[89] سوورەتی الطور ئایەتی ٣٥-٣٦.

[90] سوورەتی العنکبوت ئایەتی ٦١.

[91] سوورەتی العنکبوت ئایەتی ٦٣.

زانیارییەکان تەنیا ئەوەیان سەلماندبێ کەبوونەوەر سەرەتای هەبووە، بەڵکو زیاد لەوە ئەوەشیان سەلماندووە کە ملیۆنەها ساڵ لەمەپێش بەیەک جار دەستی پێکردووەو -بەدیهاتووە-. ئەوەی ئەمڕۆ باوەڕی بەئەنجامی زانیارییەکان هەبێ، دەبێ باوەڕیشی بە بیری دروست کراو هەبێ، هەرگیز ماقووڵ نییە دروستکراو هەبێو دروست کەر نەبێ، بەدیهێنراو هەبێو بەدیهێنەر نەبێ، کەئەو بەدیهێنەرەش (اللـه)یە).[92]

*دووەم:*

زانیاری نوێ بۆ هەمیشە دەرگای ئەو قسەیە داخست کە دەڵێ: ئەم بوونەوەرە، یا بەشێک لەم بوونەوەرە، بەڕێکەوت پەیدابووە، چونکە زانیاری بیرکاری (الرياضيات) -کە ڕێکخەری حسابەکانی زانیاری نوێیە- باسی بابەتی ڕێکەوتی لەسەر بنچینەیەکی بیرکاریەوە کردووە، وە بەئاشکرا روونی کردۆتەوە، کە : بەشی ڕێکەوت لەپەیدابوونی هەموو بوونەوەر، یا بەشێکیدا، بەپێی زانیاری بیرکاری. سفری (ریاضي)یە. ئەو سفرەش بەپێی پێناسەی بیرکاری زانان: زۆر بچوکترە لە بچوکترین ژمارەیەک بێت بە خەیاڵ دا.

هەرچەند وادەردەکەوێ ڕێکەوت پەرتەوازەو بەرەڵاو بێڕێکخستن بێ، بەڵام گەردن کەچە بۆ چەند یاسایەکی بڕندەو بەپەتێکی قایم پەتی دەکەن..

مامۆستا ا، کریسی مۆریسۆن[93] لەوبارەوە نموونەیەک دێنێتەوەو دەڵێ:

( دە تاک سکە بێنەو بەتەرتیب ژمارەیان لێبدە، هەر لەیەکەوە تا دە، ئینجا بیان خەرە گیرفانتەوەو بە توندی بیاندە بەیەکداو هەڵیان شێوێنە، ئنجا هەوڵ بدە بەپێی تەرتیبی ژمارەکان هەر لە (١)ەوە تا (١٠) دەریان بێنە!).

بێگومان هەلی دەرهێنانی سکەی ژمارە (یەک) بەرێژەی یەک لە دەیە، وە هەلی[94] دەرهێنانی ژمارە (یەک و دوو) یەک بە دوای یەکدا، بەرێژەی یەک لە سەدە، وە هەلی دەرهێنانی ژمارە (١و٢و٣) بەتەرتیب، بەرێژەی یەک لەبەرامبەر هەزارەوەیە، وە هەلی دەرهێنانی ژمارە(١و٢و٣و٤) بەتەرتیب، بەرێژەی یەک لەبەرامبەر دە هەزارەوەیە. تا وای لێ دێت هەلی دەرهێنانی هەموو سکەکان هەر لەیەکەوە تا دە -بە تەرتیب- بەرێژەی (یەک) دەبێ لەبەرامبەر دەملیۆنەوە، ( ١ بۆ ١٠٠٠٠٠٠٠ملیۆن)ە.

( مەبەست لەم نموونە ساکارە ئەوەیە، کە : بۆت روون بکەینەوە چۆن ژمارەکان بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لەدژی ڕێکەوت زۆر دەبن!!) .

---

[92] بەشێکە لەوتارێکی زانای ئەمریکی (ئێدوارد لۆسەرکیل) لەکتێبی (الله يتجلى في عصر العلم) .

[93] بەشی یەکەم ( عالمنا الفذ) لە کتێبی (العلم يدعو للإيمان) لاپەرە ٤٩.

[94] هەل = الفرصة ، ڕێژە = النسبة .

( ئەگەر ژمارەکان هەر لەسەرەتاوە تا بەو جۆرە لەدژی ڕێکەوت زۆر ببن، بێگومان ئەگەر بمانەوێ ئەو تاقیکاریانە چەند جارێک دووپات بکەینەوە بەجۆرێکی وا زۆرو زۆر دەبن کە هەرگیز نەیەت بە خەیاڵمان دا )

زانای ناوبراو دەڵێ :

( وا،دابنێین کیسەیەکت پێیەو ئەم کیسەیەیش سەد پارچە مۆری تێدایە نەوەدو نۆیان ڕەشن و دانەیەکیشیان سپیە، ئێستا کیسەکە هەڵبتەکێنەو یەک دانەی لێدەربێنە. ئەگەر پارچە سپیەکە بێت بەدەستەوە، ئەوا ڕێژەی ڕێکەوت لەو کارەدا یەک بۆ سەدە..

ئێستا پارچە سپیەکە بخەرەوە ناو کیسەکەو تێکیان بدە بەیەکداو سەر لەنوێ دەست بکە بە دەرهێنانیان، هەلی ئەوە کە مۆرە سپیەکە بێت بەدەستەوە هەر یەک بۆ سەدە، بەڵام ئەگەر دووجار یەک لەدوای یەک مۆرە سپیەکە بێت بەدەستەوە ئەوا ڕێژەی ڕێکەوت یەک بۆ دە هەزارە ، ١٠٠ × ١٠٠ = ١٠٠٠٠ .

( بۆ جاری سێهەم ئەم کارە تاقیبکەرەوە، هەلی ئەوە کە ئەمجارەیش مۆرە سپیەکە بێت بەدەستەوە -سێجار لەسەر یەک- سەد لە دەهەزارە ١٠٠×١٠٠٠٠=١٠٠٠٠٠٠ یەک لەبەرامبەر یەک ملیۆنەوە.[٩٥] خۆ ئەگەر بۆ جاری چوارهەم و پێنجەم هەم ئەو کارە تاقی بکەیتەوە، ژمارەی هەڵدەگرێ - احتمال- ئەوەندە زۆر دەبێ لە حیسابی ئێمە دەچێتە دەرو دەبێ حسابی ئاسمان شناسانی بۆ بەکاربێنین ).[٩٦]

ئەم نموونەیە بەڕوونی ئەوەمان پیشان دەدات، کە: ئەوەی بەڕێکەوت ڕوودات، زۆر زەحمەتە جارێکیتر دووبارە ببێتەوە، وە مەحاڵیشە ئەو ڕێکەوتە بەردەوام ڕوو بدات و بەرێک و پێکی دووبارە ببێتەوەو بەبێ خراپ بوون و تێکچوون بڕوات بەڕێوە.. کاتێ ڕاستەقینەکان (الحقائق) ئاوەها گۆڕابن، وە کاتێ دان بنێین بە تایبەتییەکانی عەقڵمان دا، ئەگەر ژیان و یاساو ئەندازەگیری بکەینە دەستکردی ڕێکەوتی خەیاڵیو واز لە هەموو بەڵگەو دەلیل و ژێربێژییەک بێنین، ئەوپەڕی شێتیو گێلییەتییە..

ئابەم ڕوون کردنەوەیەدا دەزانین ، کە : باوەڵی پیتەکان -ئەوەی کە هەندێ لە ماددیەکان بە نموونەی کاری بە ڕێکەوت هێناویانەتەوە- خەیاڵێکەو هیچیتر. -ئەو خەیاڵەش بەپێی ئەو دەستوورەی بیرکاری کە باسمان کرد- مەحاڵە ڕوو بدات .. ئەگەر - بە فەرزی مەحاڵ- وادابنێین ڕوویش بدات، مەحاڵە دووپات ببێتەوە یا جێگیر ببێ، با ئەوەش بوەستێ کە ئەم نموونەی (باوەڵە) چەندەها کەلەبەرو

---

[٩٥] واتە ئەگەر یەک ملیۆن جار دەست بکەیت بەناو کیسەکەدا، ئەوکاتە هەڵدەگرێ سێجار لەسەریەک ئەو مۆرە سپیە بێت بەدەستەوە.

[٩٦] بەشی شانزەهەم (ڕێکەوت) لاپەڕە ١٩١.

ناتەواوی تێدایەو قسەکەی خۆمان هەڵدەوەشێنێتەوەو داوای فەرزێکی تر دەکات جگە لەفەرزەکانی ڕێکەوت، هەروەک مامۆستا (عقاد) دەڵێ:

(أ) *ئەوان لەدەستیان چووە کە نموونەمان بەو پیتانە هێناوەتەوە کە هاوکێشەو هاوڕێژە لەنێوانیان دا هەیە و بەپەیوەندی قسەو (لفظ)ەوە پەیوەندن و لەوانیشەوە قسەی زانراو دروست دەبێت. ئەمە لەکوێو ئەوە لەکوێ، کە* پارچەکانی ماددەی یەکگرتوو بەپەیوەندی هاورەنگیو هاوێنەبوونی ناوخۆیان پەیوەندن. ئەم پەیوەندییە لەکوێو پەیوەندی نێوان پیتەکانی (ابجدی) لە کوێ؟ ماددە لەکوێی بوو ئەم جۆراو جۆرییە لە پارچەکان و بەشەکانیا بێنێ؟ وە ئەگەر جۆراوجۆریش هەبوو قابیلیەتی یەکیەتیو یەکگرتنی لە کوێ بوو؟[97]

(ب) *وەهەروەها لەکیسیان چووە، کە: فەرزەکەیان پێش خستووە بەسەر بوونی هێزێکی ئەوتۆدا کە سەرپەرشتی یەکخستن و جێبەجێ کردنی دەکات.* عەقڵ شتیوا بەپێویست نازانێ کە هێزێکی وەها لەنێوان ئەو حەرفانەدا هەبێت ..

(ج) *لەگەڵ ئەمەو ئەوەدا ئەوەشیان لەکیس چووە کە، وایان داناوە لەم کۆهێزەدا*[98] *: کە لەهەموو ئیحتیمالێکدا یەکخستنی پیتەکان دووپات دەکاتەوە،* وەک ئەوە لەسەرەتاوە زانیبێتی کە هەموو ئیحتیمالەکان چۆن دەبن!!

(د) *جگە لەوانەی رابورد ئەمەشیان لەکیس چووە، کە: گەیشتن بە ڕێکخستنێکی زانراوو هۆنراو، لازم بە وەستان لەلای ئەو ڕێکخستنە ناکات،* وە لازمیش ناکات لەسەر ئەو ڕێکخستنە پارچەکانی یەک بگرێ..

## بەڵگەی ڕەوشتی

یەکێکی تر لەو بەڵگانەی بەکارهێنراون بۆ بوونی خوا ئەو بەڵگەیەیە کە فەیلەسووفی گەورەی ئەڵمان (عەممانوئێل کانت) بەکاری هێناوە، ئەویش ئەو سیفەتەیە کە لەناو دەروونی ئادەمیزادا جێگرەو پاسەوانیی ڕەوشت دەکات..

---

[97] واتە ئەو جۆراو جۆریەی لەماددەدا هەیە قابیلیەتی ئەوەی نییە یەکبوون و یەکگرتن بەدی بهێنێت. وەک ئەوقابیلیەتە نییە کەلە حەرفەکاندا هەیە.. (فیه نظر). ( وەرگێڕ)

[98] کۆهێز = القوة الجامعة .

دوای کەو و شەن کردن و پاڵفتەکردنی لەهەموو زیادەو پەراوێزێک، ناوەرۆکی بەڵگەکە بەم جۆرەیە: بوونەوەر بەدیهێنان و ڕێک سازی تیاکراوەو ئەندازەگیریو ڕێنموونی تیا بەدی دەکرێت، ئەمانە هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوە کە: (بەدیهێنەرێکی توانا) هەیە، بەڵام ئەو تواناو بەدیهێنانەی ئەوە ناگەیەنێ کە دەبێ ئەو خوایە بێ کە خاوەنی خێرو چاکەیەو بەهرەبەخشە. وە پێویست ناکات ئەو بەدیهێنەرە توانایە هەر ئەو خوایەبێ کە دڵی خەڵکی بە خۆشەویستیو سوپاس و ڕێزەوە رووی تێدەکات..

بەڵکو بوونی ئەو خوایە بەو بەڵگەیە ئیسپات دەبێ کە لەدەروونی مرۆڤ دا هەیە، چونکە بوونی ئو بەڵگەو نیشانەیە لە دەروونی مرۆڤ دا بەبێ بوونی خوا بەدی نایەت، ئەونیشانەو بەڵگەیەش پاسەوانیەتی رەوشتە، یا بەڵگەی ئەرک و پێویستی سەرشانە یابەڵگەی ویژدانە..

کاتێ مرۆڤ کارێکی نارەوا دەکات، خۆی خۆی تاوانبار دەکات و سەرزەنشتی خۆی دەکات کە بۆ کارێکی وای کرد؟! ئەگەر لەم بوونەوەردا میزان و ترازوویەک بۆ حەق و راستیی نەبێ، کە لەدەروونی ئادەمیزادا ئەوە بنێژێ کە هەست بە حەق و بەناحەق بکات، مرۆڤ لەکوێوە ئەمەی هێنا کە لەسەر کاری ناهەق سەرزەنشتی خۆی بکات؟!

چی ئەمەی لە سروشتی مرۆڤ دا جێگیرکرد کە: ئەرکی سەرشانێکی ئێسک قورسی بەلاوە چاکتر بێ، تا مل کەچی بۆ هەواو هەوەسێک کە خۆشەویستە لەلای ؟! هەرچەند کەس ئاگاداری زیندانی سرو رازیشی نەبێ؟![99]

بێگومان بوونی ئەم پاسەوانە رەوشتی‌یە لە دەروونی مرۆڤ دا بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە لەوێدا نێژەرێک هەیەو لە دەروونەکانا ناشتوویەتی، تا رێرەوی ژیان راست و پایەداربێو کاری کۆمەڵیش ڕێک و پێک بێ، وە ئەونێژەرەش (اللە)یە، کە سەرچاوەی خێرو دلۆڤانیو جوانییە.

قورئانیش هێمایەک بۆ ئەم بەڵگەیە دەکات و دەفەرموێ: ( ونفس وما سواها فألهمها فجورها وتقواها، قد أفلح من زكاها وقد خاب من دساها)[100] واتە: سوێند بە دەروونی ئادەمیزادو ڕێکخەرەکەی، پاش ئەوە ئیلهامی کرد کە چی خراپەو بەدکارییە، وە چیش چاکەو پارێزکارییە، جا، ئەوەی دەروونی خۆی پاک بکاتەوە بەڕاستی سەرفرازەو ئەوەش ئادەمییەتی خۆی وون بکات و کردەوەی خراپ بکات زەرەرومەندەو بێ هیوا..

---

[99] بۆ نموونە: کەسێک پوولێکی زۆر دەدۆزێتەوە، دەزانێ هی کەسێکەو جەرگی براوەوپشتی شکاوە، بەزەیی پیادا دێتەوەو دەزانێ خواردنەکەی کارێکی نارەوایەهەرچەند ئارەزووی دەروونیشی حەزی لەپارەو پوولە، بەپێچەوانەی ئارەزووەکەیەوە، پوولەکە دەداتەوە بەخاوەنی.. (وەرگێڕ)

[100] سوورەتی الشمس ئایەتی ٧-٨.

پاریزکاری خستنه ناو دڵ ، یەعنی پێبەخشینی چاودێریکی رەوشتی کە بەرەنگاری داخوازیەکانی نارەزووکاریو هەواو هەوەس و خراپەکاری دەکات.

هەندی کەس رەخنە لەم بەڵگەیە دەگرن و دەڵین: بوونی رەوشت و ویژدان وهەست کردن بە ئەرکی سەرشان بەرهەمی باوی کۆمەڵایەتیەو بەدرێژایی رۆژگار لە دڵ و دەروون دا جێگیر بووە. تا بووەتە نارەزوویەکی پەسەندو داخوازییەکی خۆشەویست ..

بەڵام ئەو جۆرە رەخنەگرانە لەیادیان چووەتەوە، کە: (باوی کۆمەڵایەتی) تەفسیر نییە بۆ پەیدابوونی رەوشت، باو بریتیە لە دووپات بوونەوەی رواڵەت و بینراوی ناو کۆمەڵ، هەروەك بینیومانەو دەیزانین . خۆ ئەگەر کەسێك پرسیاریان لێ بکات و بڵێ: باوی کۆمەڵایەتی بۆ پەیدابووە؟ دەڵێن: لەبەر بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی. بەڵام ئیتر لە خۆیان ناپرسن: بۆ دەبێ تەنیا بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی حوکم بەرووداو و پەیدابوونی بکات و بەس ؟

بێگومان ئەمەش، کە: رێزی بەرژەوەندی گشتیو کۆمەڵایەتی بدرێ بەسەر بەرژەوەندی تایبەتیو نارەزووی تەنیا کەسیدا ، ئە ئەمەش خۆی شوێنەوارێکە لە شوێنەوارەکانی ئەو پاسەوانە ویژدانییە کە ئەوان ئینکاری دەکەن..

## بەڵگەی سرووش

بەڵگەیەکی تر لەسەر بوونی خوا ئەو پەیامەیە کە پێغەمبەران ﷺ هەر لەسەردەمی نوحەوە تا سەردەمی محمد ﷺ یەك لەدوای یەك هێناویانە، هەموویان قەومەکانیان بانگ کردووە بۆلای خواو بەیەك ناسینیو پەیوەندی بوون بە خواوە. وە ئاگاداریشیان کردوونەتەوەو ترساندوویانن لەهاوبەش پەیداکردن بۆ خواو پشت کردنە بەرنامەی خوا..

لەنێوان ئەوان و میللەتەکانیانا کێشمە کێشێکی تاڵ و سەرومڕ رووی داوەو بەریا بووە.. وە نەبێ ئەم ناکۆکیەش لەبەرئەوە بووبێ کە خەڵکەکە باوەڕیان بەخوا نەبووبێ، نەء ... بەڵکو لەبەرئەوە بوو کە ئەوان ئینکاری ئەوەیان دەکرد ئەمانە لای خواوە هەڵبژێررابن و بۆ لای ئەوان نێررابن.. خوایش بە نیشانەی رۆشن و موعجیزەی گەورەوە پشتیوانی پێغەمبەرەکانی دەکرد، تا بەو موعجیزانە راستیەتی پێغەمبەران بسەلمێنێو قورقەپیش بە نەیارەکانیان بکات، ئەوەی کە بەشوێن حەق دا دەگەڕا ئیمانی دەهێناو شوێن پێغەمبەرەکە دەکەوت، ئەوەش کەسەرسەخت و خۆبەزل زان بوو، کافر دەبوو باوەڕی نەدەکردو ئیمانی پێ نەدەهێنا..

دیاریترین نیشانەی راستییان ئەوەبوو ئەو پێغەمبەرانە ﷺ لەگەڵ ئەوەدا کە لاوازبوون و یارمەتی دەریان کەم بوو، دوژمنانیان بەهێزو زۆربوون- خوا سەری خستن و کۆمەکیی‌کردن و لەناو خەڵکیدا یادی نەمری‌و هەمیشەیی پێبەخشین و دوژمنی لەناو بردن و شوێنکەوتەکانیانی لەسەر زەویدا جێگیرکردو کردنیە پێشەواو میراتی لەخوا یاخیبوانی پێ بەخشین ..

لە نیشانەو ئایەتی پێغەمبەران نیشانەو ئایەتێک ماوەتەوە کە هاتنی یەک بەدوای یەکی شەوو رۆژ زیانی پێناگەیەنێ‌و نوێیەتیەکەی کۆن ناکات و بگرە بەدرێژایی ساڵ و چەرخ و سەردەمەکان تەڕ‌و تازەیی زیاتر دەبێت.. ئەو نیشانەیەش ئەو کتێبە هەمیشە پارێزراوەیە کە باتڵی تیا نییە و ئەوییش (قورئانی پیرۆزە) ئەو کتێبە موعجیزەیە وە نەبێ تەنیا نیشانەو بەڵگەبێ لەسەر پێغەمبەریەتی محمد ﷺ و بەس، بەڵکو نیشانەو بەڵگەیە لەسەر بوونی خوای‌گەورەو زانیاری فراوانی‌و کاربەجێیی‌و کەماڵی ناوو سیفەتەکانی.. هەرچەند زانیاری پێش بکەوێت و زانستی مرۆڤ پەرەبسێنێ، زانایان زیاتر گەنجینەی شاراوەی قورئان دەدۆزنەوەو گومانی گومانداران پێ لادەبەن و ئیمانی خاوەن باوەڕانی پێ زیاد دەکەن، خوای گەورە خۆی راستی فەرمووە کە دەفەرموێ: (سنريهم آياتنا في الآفاق وفي أنفسهم حتى يتبين لهم انه الحق... )[101] واتە: لەمەولا نیشانەکانی خۆمانیان لە بوونەوەرو دەروونی خۆیانا پیشان دەدەین تا بۆیان روون ببێتەوە کە ئەوە حەق و راستە .

پەیامە ئاسمانیەکان نیشانەیەکن لە نیشانەکانی بوونی خوای تەعالاو تەنیایی بوون و کەماڵی.. یەکێک لە نیشانەکانی رەحمەتی خوا ئەوەیە: کە تەنیا بە پێبەخشینی عەقڵ و رێنموونییەکی سروشتی (فطری) وازی نەهێناوەو لەدەروون و بوونەوەردا چەندەها نیشانەو شایەتی داناوە کە مرۆڤ رێنموونی دەکەن بوی لای خواو بەڵگەن لەسەر بوونی خوا، زیاد لەمانە هەمووی، پێغەمبەرانیشی بە دەلیل و بەڵگەوە رەوانەکردووە، تا خەڵکی رێنموونی بکەن بۆ رێگەی راستی خواناسی.

ئەو پێغەمبەرە بەرێزانە ﷺ لەناو میللەتانی جۆراوجۆرو لەچەندەها سەردەمی جیاوازدا بوون، عەقڵی ساغ هەرگیز قبوولی ناکات و بەوە قایل نابێ کە هەموو پێغەمبەرەکان ﷺ رێبکەون لەسەر ئەوە، کە : نێرراوی خوایەکن و ئەو خوایەش وجوودی نەبێ!!

ئەگەر وا دابنێین وابێ، -هەروەک دەڵێن: فەرزی مەحاڵ دروستە- ئەی کێ پشتیوانیان بوو و سەری خستن؟ خۆ ئەوان هەژاربوون و ماڵیان نەبوو ، لاوازبوون و پلەوپایەو مەقامیان نەبوو، کەم بوون و شوێن کەوتەیان زۆر ەبوو؟؟ کێ عادەتی

---

[101] سوورەتی فصلت ئایەتی ٥٣.

بوونەوەری بۆ تێک دان؟ کێ یاسای بوونەوەری بــۆ هەڵبواردن؟ کـێ بـە نیشـانەو موعجیزە کۆمەکی پێ کردن؟ کە دوایین موعجیزەو گـەورەترینیان و نـەمرترینیان ئەو قورئانە گەورەو پیرۆزەکەیە؟؟

کێ ئەم کتێبەی ناردەخوارەوەو پێش تریش تەورات و ئنجیل ؟

( قل : الله، ثم ذرهم في خوضهم يلعبون)[١٠٢] واتـەک بلـێ: (اللـه) خـوا، ئیـتر وازیان لێ بێنەو وێڵیان کە با لەبێئاگاییو هەواو هەوەسی خۆیانـا یـاری و گەمـە بکەن!!

## بەڵگەی مێژوویی

لەژوور بەڵگەی سروشت و بەڵگەی بوونەوەرو بەڵگـەی رەوشـتیو بەڵگـەی سرووش (الوحي)ەوە بەڵگەی مێژوویش هەیە.

ئەوەی لاپەڕەکانی مێژوو هەڵبداتەوە دەبینێ کۆمەڵێ نادەمیزاد لەهەموو ناوچە گەرم و ساردەکاندا، وە لە هەموو جۆرە رەگـەزو توخـم و رەنگـەکان دا، بـە سپی پێسـت و رەش پێسـتیەوە، وە لـە ناسـت و پلـەی هەمـەجۆرو جیاجیـادا، شارستانی بێ یـا دەشـتەکی، لەهـەموو چینێـک دا -دەوڵەمـەند بـێ یـا هـەژار، لەهەموو سەردەمێک دا کۆن بێ یا نـوێ، ئـەو کۆمەڵانـەی ئـادەمیزاد بـەجۆرێک لەجۆرەکان باوەڕ بە خوایان زانیوە.. ئێمە لەوەپێش باسی قسەکەی (بلۆتارک)مـان کرد، کە ئەو مێژووانە بەناوبانگە دەڵێ :

( بەدرێژایی مێژوو شارێک نـەبووە بـێ عیبادەتخانـەبێ، هەرچـەند شـاری بێقەڵاو قوللە، یا بێ کۆشک و تەلار هەبووە).

وەهەروەها قسەکەی فەیلەسوفی فەرەنسایی (برگسۆن)مـان بـاس کـرد کـە گوتوویەتی: ( کۆمـەڵانی ئادەمیزادی وا هەبووە و دەیش بێ کە زانیـاریو هونـەرو فەلسەفەیان نەبووبێ، بەڵام هەرگیز کۆمـەڵانێکی وا نەبووە کـە بـێ دیـن بووبـن و دیانەتیان نەبووبێ) .

بەڵێ ئەو کۆمـەڵانەی ئادەمیزاد هەموویان باوەڕیان بە بوونی خوایەک بووە کە شیاوی رێزگرتن و پەرستن بێ، وە ئەم باوەڕەش جێگەو شوێنەواری لـە ژیـان و خوو رەوشت و پەیوەندی نێوانیان دا بووە. ئایا دەگونجێ هەموو جۆری ئـادەمیزاد لەهەموو بەرەو جیلەکانیا لەسەر غەیری حەقیقەت کۆببنەوە؟!

---

[١٠٢] سوورەتی الأنعام ئایەتی ٩١.

ئەوەی ڕێزی ئەوعی مرۆڤ بگرێو ڕێزی ئەنجامی مێژوو بگرێو ڕێزی عەقڵی خۆی بگرێ، دەبێ بەوە قایل بێ، کە : یەکڕابوونی مێژوویی بەڵگەیە بۆ سەلماندنی ئەو حەقیقەتە گەورەیە، کە ئەویش بوونی خوای تەعالایە..لادانی هەندێکەس یا بەشی زۆری ئەوانەی باوەڕیان بە بوونی خوایەک هەبووەو بەڵام لە ڕێبازی ئایینی ڕاستەقینە لایان داوە، ئەوە ناگەیەنێ کە ئەو حەقیقەتە نەبێ، بەڵکو بوونی ئەو حەقیقەتە دەسەلمێنێ، چونکە ئەوان هەستێکی زۆرو فراوانیان بەرامبەر خواپەرستی تیابووە، بەڵام بەدرێژایی ڕۆژگار هەواو هەوەس زاڵ بووە بەسەریاناو ڕەمزو نیشانەیان بۆ خوا داناوە کە بریتییە لە بتەکانیان، پێیان وابووە ئەمانە ڕواڵەتێکن بۆ دەرکەوتنی خواو بەشێک لە سیفاتی خوایان پێداون و بە نیشانەی خوایان زانیون، یا پێیان وابووە لە ئەوەی خوان و لەم بابەتە خەیاڵانە.. لەبەر ئەوە ئەرکی سەرشانی پێغەمبەران ڕاست کردنەوەی ئەو بۆچوونە لارەی ئەوان بووە لەگەڵ ساغ کردنەوەی باوەڕیان و پاڵفتەکردنی لەهەموو لیتەو گەردو تۆزێکی بت پەرستیو خەرافاتەکانی..

کەوابوو هیچ جێگەی سەرسوڕمان نییە کە قورئان هانمان بدات بۆ: بەسەرزەویدا گەڕان و سەرنج دانە مێژووی پێشینان و پەندوەرگرتن لە تیاچوونی باوەڕنەکەران، وە بە عەقڵێکی بیناو دڵێکی گوشادەوە بیر لە شوێنەوارەکانیان بکەینەوە، ئەوەتە قورئان دەفەرموێ: ( قل سيروا في الأرض ثم انظروا كيف كان عاقبة المكذبين!!)[١٠٣] واتە: بڵێ: لەسەر زەویدا بگەڕێن، ئینجا سەرنج بدەن: عاقیبەتی ئەوانەی باوەڕیان بە پێغەمبەران نەهێناوە، چۆن بووە؟ یا ( أفلم يسروا في الأرض فينظروا كيف كان عاقبة الذين من قبلهم دمر الله عليهم وللكافرين أمثالها)[١٠٤] واتە: ئەوە بۆ لەسەر زەویدا ناگەڕێن، تا سەرنج بدەن و بزانن عاقیبەتی بێباوەڕانی پێش خۆیان چۆن بووە؟ خوا وێرانی کرد بەسەریانا.. ئەوانەی حەق دەناسن و شوێنی ناکەون هەمان وێنە سزایان بۆ هەیە..

یا ( أفلم يسيروا في الأرض فتكون لهم قلوب يعقلون بها، أو آذان يسمعون بها فإنها لا تعمى الأبصار ولكن تعمى القلوب التي في الصدور)[١٠٥] واتە: ئەوە لەسەر زەویدا نەگەڕاون، تا دڵێکتان بۆ دروست ببێ شتی پێ دەرک بکەن، یا گوێیەکیان بۆ پەیدا ببێ شتی پێ ببیستن؟ کوێریی چاو کوێریی نییە، بەڵام کوێری کوێربوونی بینایی ئەو دڵەیە لەقەفەسەی سنگ دا .

لەڕاستیدا ئەزموونی مێژوو وەک ئەزموونی واقیع وایە، هەموویان دەبنە قسەو شایەتی دەدەن، بۆ: ڕەسەن بوونی باوەڕ بە بوونی خوا، وە بە پێویستیشی

---

[١٠٣] سوورەتی الأنعام ئایەتی ١١.

[١٠٤] سوورەتی محمد ئایەتی ١٠.

[١٠٥] سوورەتی الحج ئایەتی ٤٦.

دەزانن بۆ نادەمیزاد.. باوەڕ بە بوونی خوا پێویستە بۆ تاکە تاکی خەڵکی، تا ئەو تاکە کەسە: دڵنیاو بەختەوەرو ئاسوودەبێ، بۆ کۆمەڵیش پێویستە تا کۆمەڵگا جێگیربێو خۆگربێو گەشە بکات..

مامۆستا (عقاد) دەڵێ: ( بێگومان ئەزموونی مێژوو ئەوەی سەلماندوە، کە لە هەموو بزووتنەوە گەورەکانی مێژوودا دین دەورێکی باڵای هەبووە، وە بوار بەکەس نادات پێی وابێ کە: کۆمەڵ دەتوانێ بیروباوەڕی ئاینی لەناو ببات، یا تاکە تاکی خەڵکی لە پەیوەندیان دا بە کۆمەڵەوە، یا لە نێوان خۆیان و دەروونیان دا، پێویستیان بەدین نەبێ، کۆمەڵ ناتوانێ دین لەناو ببات و تاکیش پێوستی پێیەتی )

وە هەروەها مێژوو بۆمان دەسەلمێنێ کە : لەناو بزووتنەوە ئینسانیەکاندا هیچ ئامێرێک نەبووە بەقەد ئامێری ئیمان و دین شوێنەواری بەهێزترو گەورەتری بووبێ، وە لە بزووتنەوەی میللەتان دا هەرچی ئامێرو کاریگەریتر هەیە -جگە لەدین- ئەو ئامێرانە لە هێزو توانایی‌دا جیاوازبوون، چەند نزیک بووبن و لە دین چووبن ئەوەندە بەهێزبوون، چەند دووربووبن و لەیەکتر نەچووبن ئەوەندە لاوازبوون .. ئەو ئامێرانە چەندە توانای جێگیربوونیان بووبێ لەناو دەروون و هەست و سۆزی رەسەنا، ئەوەندە بەهێز بووە ) .

( هێزی رەگەزپەرستیو هێزی نیشتمان پەرستیو هێزی باوونەریتی کۆمەلایەتیو هێزی رەوشت و هێزی یاساو دەستوورەکان ، ئەمانە هیچیان لەهێزی دین ناچن، چونکە جیاوازی زۆر لەنێوان پەیوەندی‌یەک کە لەنێوان مرۆڤ و خوادا هەیە، وە پەیوەندی‌یەک کە لەنێوان مرۆڤ و نیشتمانەکەیا هەیە، یا پەیوەندی‌یەک لەنێوان خۆیو کۆمەڵگاکەیا هەیە، یا پەیوەندی‌یەک کە لەنێوان ئەوو هاوجۆرەکانیا هەیە بەپێی ژمارەی نیشتمان و میللەتەکان ) .

( بەلام پەیوەندی دینی دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندی لەنێوان مرۆڤ و هەموو بوونەوەردا ، گۆڕەپانێکی بەربلاوی وای هەیە کە هەرچی وا لەم بوونەوەرەدا دەیگرێ بە دیوی ناوەوەو دەرەوەی، وە بەنهێنیو ئاشکرایەوە، بە رابوردوو داهاتوویەوە، بێ دوایی‌هاتن و کۆتایی، وە لەنێوان ئەزەلێک دا کە لەمەوپێشی لەژمارە نایەت، وە ئەبەدییەک دا کە لەمەودوای لەژمارەنایەت و ئەو شتانەش کە جیهانی غەیب دەری‌دەخات و پەردەی لەسەر لادەبات. ئەمە بەلای کەمەوە مەیدانی بیروباوەڕی دینی‌یە لە نموونەی بەرزی‌داو ئەوپەڕی ئامانجی‌دا ، هەرچەند لەهەموو سەردەمەکان دا دڵی دینداران نەیگرتبێ. )

یەکێکی‌تر لەو بەڵگانەی کە رەسەنیەتی پیشان دەدات ئەوەیە: تۆ ئەو رەسەنیەتە هەست پێ دەکەیت کاتێ بەرامبەری دەکەیت بەو کۆمەلانەی دینیان هەیەو ئەو کۆمەلانەیش کە دینیان نیە، یان وازیان لەبەشێکی گەورەی دین هێناوە) .

( وه هەروەها کاتێ بەراوردی لەنێوان کەسێکی ئیماندارو کەسێکی بێئیماندا دەکەیت، ئەم رەسەنیەتەت دووبارە بۆ دەردەکەویت. خاوەن باوەڕێک کە بەتەواوی پابەندە بەعەقیدەو بیروباوەڕەکەیەوە، وە بێباوەڕێکیش کە ویژدانی خۆی ماتڵ کردووەو هەستی شپرزەیەو، لەژیانیا وێڵە، نە تەوەرەیەکی هەیە پەنای پێببات، نە هیواو ئاواتێکی هەیە بلند بێتەوە بۆ لای) .

( ئەم جیاوازییە لەنێوان ئەو دوو کۆمەڵەو ئەو دوو جۆرە کەسەدا، وەک جیاوازی نێوان ئەو دوو دەرختە وایە، کە: یەکێکیان بنجی داکوتاوەو خۆگرەو مەحکەم، ئەوی تریشیان رەگەکەی قرتاوەو لەبنەوە هەڵکێشراوە).

( کەم وادەبێ ئینسانێک ببینیت ویژدانی ماتڵ کردبێو کەچی شتێک هێزو گەورەیی تیابێ، ئەگەر شتێکی وایشت تیا بەدی کرد، هەست دەکەیت ئەگەر لەبیاتی ویژدانی بەتاڵیا، ویژدانی پڕ عەقیدە بوایە، زۆر بەهێزترو گەورەتر دەبوو)[106]

## ئەو پەردانەی دەکەونە نێوان خەڵک و ناسینی خوا

لەوانەیە کەسێک بپرسێت و بڵێت: ئەگەر بەڵگە لەسەر بوونی خوا ئەوەندە روون و بەهێزو فراوان زۆرە، بۆچ دەبینین هەندێ کەس ئینکاری بوونی خوا دەکەن و باوەڕی پێ ناهێنن و دەڵێن: ( ... ماهي إلا حياتنا الدنيا نموت ونحيا،وما يهلكنا إلا الدهر.. )[107] واتە: جگە لە ژیانی دنیامان ژیانێکی ترمان نیە، لەدایک دەبین و دەژین و دەمرین، تەنیا رۆژگاریش لەناومان دەبات؟ ئیتر نە خوا هەیەو نە قیامەت.. بۆچ وا دەڵێن و باوەڕیان نییە؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: چەند پەردەیەکی چڕوپڕ کەوتۆتە نێوان هەندێ کەس و ناسینی خواو باوەڕ بە خواوە، ئەو پەردانەش بەرهەمی دەستی خەڵکییەو خوا لە سروشتیانا دای‌نەناوە، ئێمەش ئەو پەردانەمان ناونا تیغە :

---

[106] حقائق الإسلام وأباطيل خصومه لاپەڕە ١٥-١٦ .

[107] سوورەتی الجاثية ئایەتی ٢٤.

## ١- بەنەبوو دانانی هەرچی بەر هەست نەکەوێ :



یەکەم تیغەیەکێ لەو تیغانە، کورت هەڵهێنانی زانیارییە لەبازنەی ئەوشتە هەست پێکراوانەی منداڵان تیایدا دەژین و شتێکی تر جگە لەوانە نازانن.

ئەو جۆرە کەسانە لە ژێرو بیریان دا زیاتر لە منداڵ دەچن، تا گەورە، چونکە دەڵێن : ئەگەر -هەروەکێ ئیمانداراکان دەڵێن- خوا هەیە، بۆ چ بەچاو نایبینین و بەهەستەکانمان دەرکی ناکەین، هەروەکێ شتەکانی تر دەیبینین و هەستیان پێ دەکەین؟ ئایا دروستە باوەڕمان بە شتێ ببێ کە نایبینین؟

وەلام : کورت هەڵهێنانی بوونەوەر لە بینراو و هەست پێکراودا کارێکی دروست نیە، چەندەها شت هەیە، نە دەبینرێو نە هەستی پێ دەکرێ!! وە هەروەها کورت هەڵهێنانی وەسیلەکانی زانستیش لە دەرکێ پێکراوەکانی هەستیدا کارێکی نادروستە، چونکە مرۆڤ لەچەند ڕێگەیەکەوە شت دەزانێو دەرکی پێ دەکات: وادەبێ لەڕێگەی سروشتیەوەو بێ بیر لێکردنەوە دەبێ، وا دەبێ لەڕێگەی عەقڵ و بیرکردنەوەوە دەبێ، وا دەبێ لە ڕێگەی بەڵگەی ئیلهامەوە دەبێ، هەروەکێ لە ڕێگەی بینین و هەستیشەوە دەبێ.

ئێستا زانایانی ئاسمان شناس ژمارەو بوونیئەو ئەستێرانە دەخەمڵێنن کە دووری نێوان ئێمەو ئەوان ملیۆنەها ساڵی تیشکی دەبێت. وە جێگاکانیشیان دەخەمڵێنن لەگەڵ دووری نێوان هەندیکێ و هەندیکی تریان دا، چونکە بوونیان لەو شوێنانەدا کە دیارییان کردوون، تەفسیری ڕواڵەت و شوێنەوارێکی تایبەتیان بۆ دەکات لە بزووتنەوەی ئەو ئەستێرانەی ئەمان مشتیان لێگرتوون و لەبۆسەدان بۆیان، وە بەوەی بینیویانە بەڵگە دێننەوە لەسەر ئەوەی نەیان بینیوە، وە بەپێی سەرنجەکانی زانیاریش ساغیو دروستی ئەو خەملاندنەی ئەوان دەردەکەوێ ..[١٠٨]

ئایا سەرزەنشتی ئەو زانایانە دەکرێ چونکە: باوەڕیان بە شتێکێ هەیە کە نەیان بینیوەو هەستیشیان پێ نەکردووە؟ لەگەڵ ئەوەدا بەهۆی ژیربێژی بیرکاری (المنطق الرياضي) یەوە ئەوان پەییان پێ بردووە، ئەو (منطق)ەی ئەو حسابەی کە لەسەر ژمارەوە دانراوە نەکێ خەیاڵ پلاو ؟

---

[١٠٨] بۆ نموونە: کە زانیاریخەملاندن (تقدیر)ەکەی ئەوانی بەراست دانراوە ئەوەبوو، زانایان ماوەی نێوان مانگێ و زەوییان بە دووسەدو چل هەزار میل خەملاندبوو، کاتێ فەزاپەیمای ئەپۆللۆیان نارد ئەوەشیان خەملاند کەچەندجارمانگێ دەسووڕێتەوە تا ئەم دەگات. وە بۆ گەڕانەوەیشی حسابیان کرد کە تادەگەڕێتەوە چەندجار زەویدەخولێتەوە.. لەهەموو ئەمانەدا خەملاندنەکەیان دروست دەرچوو.. ئەوەبوو ئەپۆللۆ لەشوێنی دیاریکراوی خۆیا لەسەرمانگێ نیشتەوەو لەکاتی گەڕانەویشیا لەجێگەی تایبەتی خۆیا هاتەخوارەوە.. وە هەروەها خەملاندنی ماوەی نێوان مەریخ و زەوی ڕاست دەرچوو کاتێ فەزا پەیمای (ڤایکینگێ)یان بۆ نارد.. هتد . ( وەرگێڕ ) .

بەڵێ ، ئەو زانایانە ئیعتیمادیان داوەتە سەر ژیربێژییەکی سادە، بەڵام راست دروست، کە ئەو ژیربێژییە سادەیەش بریتییە لە بەڵگەهێنانەوە بە شوێنەوار لەسەر شوێنەوەر ، ئەوان بە شوێنەوارا ئەستێرە دوورەکانیان ناسیوە، نەک بە خودی ئەستێرەکان دا.. هەر لەسەر ئەم رێبازەوە بوو کە زانایانی سروشتی لەبارەی ئەتۆم (ذرة)ەوە دەستان کردە لێکۆڵینەوەو یاساکانی بارستایی (الكتلة) و وزە (الطاقة)یان بەکارهێنا ، لەگەڵ ئەوەدا تا ئێستاش خۆیان ئەتۆمیان نەدیوە، ئەوەی لەو بارەوە توانیبێتیان تەنیا ئەوە بووە: بەهۆی میکرۆسکۆبی ئەلکترۆنی گەورەو سەرسوڕهێنەرەوە توانیویانە سێبەرەکەی یا تارماییەکەی ببینن، ئەویش پاش گەورەکردن و قەبەکردنی..

ئایا بانێکەو دووهەوا؟ چۆن تەسلیمی ئەم ژیربێژییە ببین و لە زانیاریەکانی سروشت و ئاسمان شناسیدا بەکار بێنین و کەچی لە ناسینی خالقی هەرەبەرزا ئینکاری بکەین ؟

دکتۆری توێژەر (دی نوێ) دەڵێ: ( بەشێکی زۆر لەوانەی زیرەکن و نیەتیان چاکە خەیاڵ دەکەن ناتوانن باوەڕیان بە خواهەبێ، چونکە ناتوانن دەرکی بکەن، بەڵام ئەو ئینسانە دەست پاکە گۆشەگیرەی ئارەزوومەندی زانیارییە، با بەوجۆرە (تەصەوور)ی خوا بکات، کە ئەو زانا سروشتناسە (تەصەوور)ی کارەبا دەکات. بێگومان (تەصەوور) لەهەردوو حاڵەتەکان دا ناتەواوو بەتاڵە، چونکە لەقاڵبی ماددیەت دا کارەبا قابیلی (تەصەوور) نییە، لەگەڵ ئەوەش دا بوونی شوێنەوارەکەی لەبوونی پارچە تەختەیەک سەلمێنراو ترە).[109]

## ٢- غەفڵەت و بێئاگایی :



دووەمین تیغە لەو تیغانە : غەفڵەت وبێئاگاییە ، ئەو بێئاگاییەی هەندێکەس دادەگرێو بیریان تووشی ئیفلیجیو عەقڵیان تووشی نەزۆکی دەکات، دەرک و ناسینیان لەکار دەخات، هەموو خەمیکیان سک پڕ کردن و تێرکردنی هەواوهەوەس و رابواردنی ئاژەڵیانەیە، ئەوانە لەراستیدا گزرەو سووتەمەنی دۆزەخن، ئەوان ئەوانەن کە خوا لەبارەیانەوە دەفەرموێ: (ولقد ذرأنا لجهنم كثيرا من الجن والإنس، لهم قلوب لايفقهون بها، ولهم أعين لا يبصرون بها، ولهم آذان لايسمعون بها، أولئك كالأنعام بل هم أضل، وأولئك هم الغافلون ) .[110]

واتە : ( ئێمە بەشێکی زۆرمان لە جنۆکەو ئینسان بۆ دۆزەخ ئامادەکردووە -جا ئەوانە کێن؟- ئەوانەن کە عەقڵیان هەیەو نایانەوێ شتی پێ حاڵی ببن،

---

[109] عقائد المفكرين في القرن العشرين للعقاد .

[110] سوورەتی الأعراف ئایەتی ١٧٩.

چاویان هەیەو نایانەوێ حەقی پێ ببینن، گوێیان هەیەو نایانەوێ حەقی پێ ببیستن، ئەوانە وەک چوارپێ وان و بگرە سەرلێشێواوتریشن، ئەوانە هەر ئەوانەن کە غافڵ و بێئاگان.)

بۆ ئەوانە لە چوارپێ سەرگەردان ترن؟ چونکە چوارپێ ئازو نیعمەت و بەخشش و هۆش و ئاوەزێکی وایان پێ نەدراوە، کە بەوان دراوە، وە هەروەها چوارپێ بۆچی دروست کرابێ ئەنجامی دەدات بێ سەرپێچی کردن، وەک شیردان و زاوزێو خورێو گۆشت، یا سواری و بارهەڵگرتن.. جا، کاتێ ئینسان لەخوای خۆی غافڵ و بێئاگابوو -ئەو خوایەی کە بۆ ناسین و پەرستن و جێنشینی خۆی ئەوی لەسەر زەوی‌دا دروست کردووە- ئەو ئینسانە لەئاژەڵ خراپترو رێلێ (ون) گومبوو ترە ..

## ٣- چاولێکەری :



پەردەی سێهەم ئەو چاولێکەرییەیە : کە (شخصية) کەسایەتی ئینسان لەناودەبات و وای لێدەکات بەعەقڵی خەڵکی بیربکاتەوە نەک بە عەقڵی خۆی، ئەگەر لە کۆمەڵگایەکی کافردا پێبگات، یا لەبەردەستی کەسانێکی بێباوەڕدا دەرز بخوێنێو قوتابی بێ، جڵەوی خۆی دەداتە دەستیان و وەک کلیلێک لەگەڵیانا دەژیو خۆی بیرناکاتەوە، ئەوان باوەڕیان بەچی بوو ئەمیش باوەڕی پێیەتی، باوەڕیان بەچی نەبوو، ئەمیش باوەڕی پێی نییە...

هی وا هەیە چاو لەوپێشین و باوباپیرانی دەکات و لاسایی ئەوان دەکاتەوە، هی وا هەیە لاسایی گەورەو پێشەواکانی دەکاتەوە، هی وا هەیە لاسایی فێرکەرو مامۆستاکانی دەکاتەوە، ئەم هەموو جۆرە لاسایی‌کردنەوانە پەردەو تیغەو دیوارن و دەکەونە نێوان خەڵکیو باوەڕ بە حەق و راستی. لەبەرئەوەیشە، کە: قورئان هێرش دەباتە سەر خۆیان و کارەکەیان و دەفەرموێ: ( وإذا قيل لهم اتبعوا ما أنزل الله، قالوا بل نتبع ما ألفينا عليه آباءنا أولو كان آباؤهم لايعقلون شيئا ولا يهتدون؟ ومثل الذين كفروا كمثل الذي ينعق بما لا يسمع إلا دعاء ونداء، صم بكم عمي فهم لا يعقلون)[111] واتە:

ئەگەر پێیان بگوترێ: شوێن ئەوە بکەون، کە خوا ناردوویەتی، دەیان گوت: نەخێر، شوێن عادەتی باوباپیرانمان دەکەوین، -هەر شوێن ئەوان دەکەون- ئەگەر باو باپیرانیشیان عەقڵیان هیچ نەبێو سەرلێشێواوبن؟ ئەوانەی کافرانی سەرسەخت بانگ دەکەن بۆ ئیمان، وەک ئەو شوانە وان کە وشترە یاخی‌بووەکانی بانگ دەکاتەوە، بەڵام ناگەڕێنەوە، وشترەکان گوێیان لە دەنگەکەیە بەڵام نازانن یەعنی چی؟ دەنگەکە دەبیستن بەڵام لە کاکڵەکەی دەنگەکە حاڵی نابن، وەک کەڕو لاڵ و کوێرن و هۆش ناکەنەوە..

---

[111] سوورەتی البقرة ئایەتی ١٧٠-١٧١.

وەهەروەها لەم ئایەتانەی ترا دیمەنی چاولێکەرو چاولێکراومان لەرۆژی قیامەتا پیشان دەدات و دەفەرموێ: ( إذ تبرأ الذين اتبعوا من الذين اتبعوا: ورأو العذاب وتقطعت بهم الأسباب، وقال الذين اتبعوا: لو أن لنا كرة فنتبرأ منهم كما تبرأوا منا، كذلك يريهم الله أعمالهم حسرات عليهم وما هم بخارجين من النار)[112] ( کاتێ ئەوانەی چاولێکراون و خەڵکی شوێنیان کەوتوون بەخە هەڵدەتەکێنن لە شوێن کەوتەکانی خۆیان و بەچاوی خۆیان سزای دۆزەخ دەبینن و دەستیان لە هەموو ئەسباب و وەسیلەیەک دەپچڕێت، ئەوانەش کە شوێن کەوتەیان بوون دەڵێن: ئەگەر بوارێکمان بۆ هەڵکەوت و گەڕاینەوە بۆ دنیا ئێمەش بەخەی خۆمانیان لێهەڵدەتەکێنین، هەروەک ئەوان لێرەدا بەخەیان لێهەڵتەکاندین ئاوەها خوا کردەوە ناشیرینەکانی خۆیان پیشان دەدات و دەیکاتە خەم و پەژارە بۆیان و جارێکی تر دەرچوونیان لە ئاگر نییە )و پاداشتی چاولێکەری و لاسایی‌کردنەوەلەیان دەبێ وەرگرن !!

## ٤- خۆبە زل زانین :



چوارهەمین پەردەیان کە چڕترین و زۆرترینیانە بریتیە لە مرقنی و خۆ بەزل زانین. بێگومان بەڵگەی سروشت و بەڵگەی بوونەوەرو بەڵگەی ویژدان و بەڵگەی سرووش (الوحی)و بەڵگەی مێژوو، هەموو ئەمانەو چەندەها ئەوەندەو ئەوەندەی تریش بەڵگەو دەلیل، قەناعەت بەو مرقنانە ناکات کە: گوێی خۆیان دەئاخنن تا دەنگی حەق نەبیستن، چاوی خۆیان دەبەستن تا رووناکی نەبینن، دڵیان دادەخەن تا تیشکی رێنموونی سەری بۆ نەکێشێ، کاتێ دەمەقاڵەو موناقەشەش دەکەن بۆ ئەوە نییە تێبگەن، بۆ ئەوەیە سەر لە خەڵکی چەواشە بکەن، بۆ ئەوە نیە قەناعەت پەیا بکەن، بۆ ئەوەیە سەرکەون ئیتر بەهەر جۆر بێ، ئەوانە کت و مت وەک ئەوانەن کە خوا باسیان دەکات و دەفەرموێ: ( ومن الناس من يجادل في الله بغير علم ولا هدى ولا كتاب منير، ثاني عطفه ليضل عن سبيل الله .. ).[113]

لەناو خەڵکیدا هی واهەیە، بێئەوەی بەڵگەیەکی دروستی بەدەستەوەبێ، یا پشتیوانیەکی لە وەحیەوە هەبێ، دەمەقاڵەو موجادەلە دەکات لەبارەی بوونی خواو پێغەمبەریەتی پێغەمبەر ﷺ وە بێ زانیاریو رێنموونیو کتێبێکی رووناک، -ئەگەر لە دەمەقاڵەو موناقەشەکەیشیان تێبشکێت- تەسلیمی حەق نابێت و مل بادەداو روو وەردەگێڕێ، هیچ مەبەستێکی نیە جگە لە سەرگەردان کردنی خەڵکیو لادانیان لە رێگەی راستی خوا ..

بێگومان ئەوەی سەرسەخت و دەمارگیرە، هەزارو یەک دەلیل قەناعەتی پێ ناکات و حەق ناپێکێ، با بەچاوی خۆیشی ببینێو دەستی لێبدات و هەستی

---

[112] سوورەتی البقرة ئایەتی ١٦٦-١٦٧.

[113] سوورەتی الحج ئایەتی ٨-٩.

پێ بکات، ئەوبوو بت پەرستەکان (المشرکون) ئەوانەی ئینکاری پەیامی پێغەمبەریان ﷺ دەکرد، داوایان دەکرد: کتێبێکیان لە ئاسمانەوە بۆ بێتە خوار، شایەتی پێغەمبەریتی بۆ محمد ﷺ بدات، وە خۆیشیان بەرزبکرێنەوە بۆ ئاسمان و بە گوێی خۆیان، گوێیان لە فریشتەکانی ئاسمانەوە بێت، کە: شایەتی بۆ بدەن محمد ﷺ پێغەمبەرە. قورئانیش داخوازییەکەیان دەداتە دواوەو بەرپەرچی سەرسەختیو پێشنیازی بەتاڵیان دەداتەوەو دەغەڵیی دەروونیان بۆ دەردەخات و دەفەرموێ:

( ولو نزلنا علیك کتابا في قرطاس فلمسوه بأیدیهم لقال الذین کفروا: إن هذا إلا سحرمبین)[114] واتە: ئەگەر کتێبێکیشت بۆ بنێرینە خوارێو لە کاغەزا نووسرابێتەوەو بەدەستیخۆیان دەستی لێبدەن، ئەوانەی کافرن دەڵێن: ئەوە چاومان خیانەتمان پێ دەکات، دەنا ئەمە جادوویەکی ئاشکرا نەبێ هیچی تر نیە. لە شوێنێکی ترا دەفەرموێ: ( ولو فتحنا علیهم بابا من السماء، فظلوا فیه یعرجون، لقالوا إنما سکرت أبصارنا بل نحن قوم مسحورون)[115] واتە: ئەگەر دەرگایەکیان لە ئاسمانا بۆ بکەینەوەو بەردەوام پیایا سەرکەون، دەڵێن: چاومان پەردەی بەسەرا هاتووەو شت وەك خۆی نابینین، نەء .. نەء .. بەڵکو جادوومان لێکراوە..

ئەوانەی مرقن و بەدەمارو خۆبەزل زانن، ئەگەر بەدەستیش دەست لە حەقیقەت بدەن دەستیان تاوانبار دەکەن، ئەگەر بە چاویشیان ببینن تۆمەت بۆ چاویان دروست دەکەن و ئینکاری حەق دەکەن و دەڵێن: گێژو بێهۆش کراوین، یا جادوومان لێکراوە، یا هەر شتێکی تر خۆی هەوەسی لیی بێ. خوای گەورە راستی فەرمووە: ( قل انظروا ماذا في السماوات والأرض؟ وما تغني الآیات والنذر عن قوم لایؤمنون)[116] واتە: بڵێ: سەرنج بدەن و بڕوانن چی لە ئاسمانان و زەویدا هەیە؟، بەڵام نیشانەکان و هۆشیارکەرەوەکان بێسوودن بۆ کەسانێ بێباوەڕبن و ئیمان نەهێنن..

خوا چەندەها ئایەت و نیشانەی لەسەر بوونی خۆی داناوە لە دەروونەکان و بوونەوەردا، تا ئەوانەی خاوەن دڵ و هۆشن پەندی لێوەرگرن، تەنیا ئەوانەی خاوەن دڵ و هۆشن، نەك بۆ غەیری ئەوان، ئای، قورئانیش چەند بە ڕەوانی باسی ئەو ئایەت و نیشانانە دەکا!! کە دەفەرموێ: ( إن في خلق السموات والأرض واختلاف اللیل والنهار لآیات لأولي الألباب)[117] و ( لقوم یذکرون)[118] و (لقوم یسمعون)[119] واتە: بێگومان

---

[114] سوورەتی الأنعام ئایەتی ٧.

[115] سوورەتی الحجر ئایەتی ١٤-١٥.

[116] سوورەتی یونس ئایەتی ١٠١.

[117] سوورەتی آل عمران ئایەتی ١٩٠.

[118] سوورەتی النحل ئایەتی ١٣.

له دروست کردنی ئاسمانان و زەوی‌و جیاوازی شەوو رۆژدا نیشانەگەلێک هەس - لەسەر بوونی خوا - بۆ ئەوانەی خاوەن دڵ و عەقڵن . یا ( بۆ ئەوانەی بیردەکەنەوە ).. یا (بۆ ئەوانەی گوێدەگرن و دەبیستن) .

لەبەرئەوە سەرسەخت و مرتنەکان بیرناکەنەوە، عەقڵیان بەکارناهێنن، یاداوەری ناکەن، شتیش نابیستن.. جا، هەرکەس ئەوە حاڵی بێ هەرگیز گوێناگرێ‌و رێنموونی ناوێت: ( إن في ذلك لذكرى لمن كان له قلب أو ألقى السمع وهو شهيد)[120] واتە: ئەبێ‌گومان ئالەوەدا یادخستنەوەو پەندو ئامۆژگاری هەیە، بۆ: ئەوەی دڵی هەبێت و خاوەنی هۆش بێ، یا گوێ بدات و بەدڵ ئامادەبێت و بزانێ چی دەبیستێ..

بێگومان ئەوەی عەقڵی خۆی ببەستێ‌و دڵی خۆی داخات و پابەندی ئینکارو ملبادان بێ، بەهەزارو یەک دەلیل قەناعەت ناکات، هەرچی وا لە ئاسمان و زەوی‌دا قەناعەت بەخشە بۆ ئەوانەی قەناعەتیان بوێت، وە رێ پیشاندەرە بۆ ئەوانەی رێنمونییان بوێت.. شاعیر دەڵێ :

بەراستی جێگەی سەرسورمانە!! چۆن سەرپێچی لە فەرمانی خوا دەکات؟! یا چۆن مونکیر ئینکاری بوونی خوا دەکات؟! لە هەموو بزوتنەوەو جم و جووڵ و وەستانێک دا شایەت لەسەر بوونی خوا هەیە، لە هەموو شتێک دا نیشانە بۆ بوونی خوا هەیە، ئیتر مونکیر چۆن ئینکاری دەکات ؟!!

---

[119] سوورەتی یونس ئایەتی ٦٧.

[120] سوورەتی ق ئایەتی ٣٧.